# بەریەککەوتنی کولتوورەکان

## مەسیحییەکان، موسڵمانەکان، جوولەکەکان

## لە چاخی دۆزینەوەکاندا

**بێرنارد لوییس**

**وەرگێڕانی**

**یاسین حاجی زادە**




ئەم کتێبە وەرگێڕدراوی ئەمەی خوارەوەیە:

برخورد فرهنگها (مسیحیان، مسلمانان، یهودیان، در عصر اکتشافات)

نویسنده: برنارد لویس – ترجمه: نادر شیخ زادگان

چاپ اول – ١٣٨١ شماره نشر ٦٤٢



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **بەریەککەوتنی کولتوورەکان**
- نووسینی: بێرنارد لوییس
- وەرگێڕانی: یاسین حاجی زادە
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: چنور ئەکبەر پوور
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ٩٥٤
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٤٠)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## ناوەرۆك

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

زۆر خۆشحاڵم بەوەی کە ئەم وەرگێڕانە ئامادەی چاپ و بڵاوبوونەوە بوو، هیوادارم لەم کاتە هەستیارەدا کە زیاتر وەك ئەوە دەچێ بۆ جارێکی تر تێکهەڵچوونە ئایینییەکان رووخساری شارستانیەتی مرۆڤایەتییان شێواندبێ و بۆ جارێکی تریش ئەم تێکهەڵچوونانە شەڕە سەلیبییەکانمان بیر دەخەنەوە، کتێبی لەمجۆرە کە بەرهەمی هەوڵ و ماندووبوونی یەکێك لە لێکۆڵەرە ناسراوەکانی مێژووی رۆژهەلاتی نێوەڕاستە، ڕێخۆشکەری نەتەوەکان و ڕێنوێنیکەری فکریی کۆمەڵگاکان بێ و بۆ خوێندکاران و توێژەران و زانایانیش سەرچاوەیەکی بەکەڵك بێ.

**نادر شێخ زادەگان**

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

منیش وەك وەرگێڕی فارسی بە ئامادەبوونی ئەم وەرگێڕانە بۆ چاپ و بڵاوبوونەوە زۆر خۆشحاڵم. زۆر رستە و بابەتی نێو ئەم کتێبە جێگای لێوردبوونەوەن و دەتوانن هەڵگری باس و خواسێکی زۆر بن. ئەرکی من نووسینی پەراوێز بۆ بابەتەکانی نێو ئەو کتێبە و دەستنیشانکردنی هەڵە و خاڵە دروستەکانی نییە، بەڵکو ئەوە ئەرکی خودی خوێنەر و رەخنەگری لێزان لە بواری بابەتەکەیە، کە ئەم کارە ئەنجام بدات. بە دڵنیاییشەوە نێوئاخنی بابەتەکە بەجۆرێکە کە دەتوانێ چەندین وتاری رەخنەیی و پشتیوانیکردن هەڵبگرێ. بەڵام منیش بە دوور لە درێژدادڕی هەوڵدەدەم لە چەند رستەیەکدا ڕای تایبەتی خۆم لەسەر بابەتەکە دەربڕم .

لە دنیای پڕ لە کێشە و شەڕ و دەمارگرژیی کەلتووری و ئایینیی ئەمڕۆ، لە دنیای لێك تێنەگەیشتن و یەکتر نەخوێندنەوە و حسێب بۆ یەکتر نەکردندا، بوونی کتێبی لەمجۆرە لە کتێبخانەکاندا وەك پێویستییەك خۆی دەنوێنێ. ئەگەر مرۆڤەکان ئەوەندەی بیر لە شەڕ و پێکداهەڵپڕژان دەکەنەوە بیریان لە گفتوگۆ و گوێگرتن لە یەکتر و ریزدانان بۆ یەکتر کردباوە رەنگە هیچ شەڕ و ئاژاوەیەك رووی نەدابایە, بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆکە گفتوگۆ و ریز و خۆشەویستی و گوێ لەیەکتر گرتن پێگەی خۆی بە هەڕەشە و خۆفەرزکردن بەخشیوە. رەنگە ئەوەی لەم کتێبەدا بە خاڵی زەقی تایبەتمەندیی نووسەر بژمێردرێ ئەوە بێ کە بە دوور لە دەمارگرژی و تەنانەت بە چاوی رەخنەوە لە کەلتووری بەرەی خۆی قەڵەمی تاو دابێ بەڵام بەو حاڵەش، من رەخنەیەکم لە رەخنە لەخۆگرتنەکانی نووسەر هەیە. هەروەها، بابەتی ئەم کتێبە وامان لێدەکا کە پرسیارێکی زۆر سەرەکی _وەك رۆژهەڵاتی _لەخۆمان بکەین، پاشان لە رووی ئەمەوە پێشنیارێکی گشتی بخەینە ڕوو.



بێرنارد لوییس _ وەك نووسەرێکی رۆژئاوایی _ زۆر بە توندی رەخنە لە کەلتووری خۆبەزلزانیی خۆیان لە بەرانبەر نەتەوە و کەلتوورەکانی دیکەدا دەگرێ لەمبارەوە رەخنەیەکی توند و زیادەڕۆیانەیە، رەنگە رووداوێکی تایبەتی ناوبراوی بەشێوەیەك هەژاندبێ کە بەم شێوەیە لە سەر خۆیان بدوێ. من نامەوێ دڵسۆزتر لەو بۆ نەتەوە و کەلتوورەکەی بم، بەڵام ئەگەر لە حەقیش لانەدەین ئەوا دەکرێ بڵێین کە رۆژئاواییەکان لە زۆر بوارەوە ناحەق نین ئەگەر بەم شێوەیەش لە خۆیان بڕوانن. ئەمەش لەخۆبەکەمگرتنی خۆمانەوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکو ئەوان هەمیشە لە رووی عەقڵ و دارشتنی بەرنامەوە کاریان بۆ ئامانجەکانیان کردووە، کەوابوو لە کاتێکی ئاوادا رەنگە بەخۆنازینیش گوناه و تاوانێکی گەورە نەبێ.

بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە هەر رۆژهەڵاتییەك _تەنانەت رۆژئاواییەکانیش_ بە پرسیارێك دەگات کە رەنگە زۆر جار بە مێشکی زۆر کەسدا تێپەڕ بووبێ و بیری بەخۆیەوە خەریك کردبێ, بەڵام رەنگە هیچ هەنگاوێکی بە کردەوەی بۆ جێبەجێکردنی ئەو وڵامەی کە پێیدەگا، هەڵنەهێنابێتەوە. نووسەر لە قۆناغە جۆراوجۆرەکاندا باس لەو داهێنانانە دەکا کە لە رۆژهەڵاتدا کراون و هەر ئەو داهێنانانەش بە سەرچاوەی سەرەکیی پێشکەوتنی ئەمرۆکەی مرۆڤایەتی دەژمێردرێ. بەڵام سەیر لەوە دایە کە بۆچی رۆژئاوا لە رووی هەمان ئەو داهێنانانەوە توانیویە بەو پێشکەوتنە مەزنە بگا بەڵام رۆژهەڵاتییەکان کە خۆیان داهێنەری ئەو سەرچاوانە بوونە نەیانتوانیوە بەرادەی پێویست کەڵك لە داهێنانەکانی خۆیان وەربگرن و پێش بکەون؟ بۆچی رۆژهەڵات وەك ناوەندی سەرهەڵدانی شارستانیەتە کۆنەکان و ناوەندی ئەو داهێنانانەی کە بواری بۆ پێشکەوتنە بەرچاوەکانی رۆژئاوای ئەمرۆکە ڕەخساندووە، نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ کاروانی هەمیشە ڕوو لە گەشەی زانست و داهێنان و پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەکان رێك بخا؟ دەبێ کارەکە لە کوێوە لەنگ بێ؟ دەبێ هۆکاری چی بێ؟ ئایا هۆکاری کەلتووری، ئایینی و زۆر شتی دیکەی لە پشتە یان ئێمە گەلانێکی دژەگۆڕان، کۆمەڵگای رۆژهەڵاتیمان پێکهیناوە؟ دەکرێ لەمبارەوە بە سەدان پرسیار لە دووی

یەك ریز بکەین بەڵام نووسەر بە وەڵامێکی کورت و پوخت وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە: "ڕۆژهەڵاتییەکان تائێستاش لە رابردووی خۆیان و کەم و کورتییەکانیان نەکۆڵیوەتەوە بۆ ئەوەی کە هەنگاوێك بۆ نەهێشتنی ئەم کەم و کورتیانە هەڵبێننەوە". کاتێك ڕۆژئاواییەکان لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی خۆیان دەکۆڵنەوە ئەدی بۆچی ڕۆژهەڵاتییەکان لە هۆکارەکانی دواکەوتنی خۆیان ناکۆڵنەوە؟! بۆچی تەنیا دەبێ ڕۆژئاواییەکان لێمان بکۆڵنەوە و میتۆدمان بۆ دیاری بکەن و کەم و کورتییەکانمان دەستنیشان بکەن و خۆمان لە خەوێکی قووڵدا بین؟! بۆچی نابێ ئێمە تەنانەت پلانمان بۆ ژیانی خۆشمان هەبێ و ئەویشمان لە دەرەوە بەسەردا فەرزبکرێ؟ بۆچی نابێ "خۆمان" بین!؟

ئێستاکە لە ڕۆژهەڵاتدا دوو ئاڕاستەی زۆر لێك جیاواز و دژبەیەك بەرانبەر بە ڕۆژئاوا و کەلتوورەکەی لە ئارادان کە بەداخەوە ڕێگایەکی سێهەمیان بۆ خۆیان نەهێشتۆتەوە. ئەم دوو ئاراستەیە بریتین لە ئاراستەی رەتکردنەوەیەکی رەها و قبوولکردنێکی رەها. واتا ئاراستەی یەکەم بەتەواوەتی ڕۆژئاوا و کەلتوورەکەی رەت دەکاتەوە و پێی وایە هەموو شتەکانی ئەو کەلتووره خراپ و دژە رەوشت و دژە بەهایە، بە هەموو توانایەوە لەبەرانبەریدا دەوەستێتەوە، تەنانەت شەڕیشی لەگەڵدا دەکا. هەروەها ئاراستەی دووهەم ئەو ئاراستەیەیە کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تامەزرۆی کەلتووری ڕۆژئاوا بووە و پێی وایە ئەم کەلتووره کەلتوورێکی بێ کەم وکورتی و مرۆڤدۆستانە و بێ غەل و غەشە و بەتەواوەتی خۆی بەدەستی ئەم کەلتووره سپاردووە بە بێ ئەوەی ڕەچاوی پێگە و بەها و نەریتی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگای خۆی بکا. بە ڕای من ئەم دوو ئاڕاستەیە هەردووکیان جۆرێك توندڕەوی و دەمارگرژی و ناواقعبینیان تێدایە، چونکە نە کەلتووری ڕۆژئاوا ئەوەندە خراپ و گەندەڵ و پاسیڤە کە بە تەواوەتی رەتی بکەیەوە و بە دوژمنی خۆتی بزانی و شەڕی لەگەڵدا بکەی" نە ئەوەندەش بێ کەم و کورتییە کە بکرێ بە بێ پاڵاوتن یەکسەر ئەم کەلتووره دەقاودەق پەیڕەو بکەی. بۆیە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە جوانترین لایەنەکانی



ئەم کەلتووره لەگەڵ داب و نەریت و کەلتووری خۆیدا تێکەل بکا بۆ ئەوەی شتێکی باش و بەکەڵکی لێ دەربچێ. وەرگرتنی کەلتووری دەرەکی بە بێ لە بەرچاوگرتنی کەلتووری کۆمەڵگای خۆت، پەرچەکردارێکی نێگەتیڤی کۆمەڵگای بە دواوە دەبێ و بەر لەوەی کە بکرێ کەڵك لە لایەنە باشەکانی ئەو کەلتووره وەربگیرێ ئەوا هەستێکی دوژمنکارانە بەرانبەر ئەو کەلتووره لە کۆمەڵگاکەدا دروست دەبێ. هیچ کەلتوورێك بەتەنیا موڵکی خۆی نییە، هەر کەلتوورێك لە ژێر کاریگەریی کەلتوورەکانی تردا دروست بووە؛ هەربۆیە هیچ کەلتوورێك ناتوانێ خۆی لە کەلتوورەکانی تر دەرباوێ. بەڵام زۆر گرینگە بزانین چۆن لایەنە باشەکانی کەلتوورێك بهێنینە نێو کەلتوورەکەی خۆمان. ئەوەش وەك هەر پڕۆسەیەکی تر پێویستی بە پلان و بیرکردنەوە و لێزانین و پسپۆڕی هەیە.

**یاسین حاجی زادە**

**٢٠٠٥/٤/١٣**

## ژیاننامەی نووسەر

پرۆفیسۆر بێرنارد لویس لە ساڵی ١٩١٧ لە بەریتانیا لە دایکبووە و دوای تێپەڕکردنی قۆناغی دواناوەندی، خوێندنی باڵای خۆی لە زانکۆی لەندەن و لە کۆلیژی لێکۆلینەوەی ڕۆژهەلات و ئەفریقیا دەستپێکرد. ناوبراو بەکالۆریۆسی لە بەشی ڕۆژهەلاّتی نزیك و ناوەند و دۆکتۆراشی لە بەشی مێژووی ئیسلامدا تەواوکرد و وەك پێویستیی خوێندنی قۆناغی دۆکتۆراکەی، سەفەری بۆ ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست کرد. ماوەیەك بۆ بوونە پارێزەر دەرسی یاسای خوێند بەلاّم هێندەی پێنەچوو کە ئاڕاستەکەی گۆڕی و دەستی بە وتنەوەی وانەی مێژووی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست کرد. لە ساڵی ١٩٣٨ بە پلەی مامۆستای یاریدەدەر لە مێژووی ئیسلامدا لەو کۆلیژەی کە خوێندنی لێ تەواو کرد بوو، دامەزرا.

بێرنارد لویس سەرەتا بە شێوەیەکی تایبەتی لەبارەی ئیسلامەوە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، لەسەر فیرقەی ئیسماعیلییە، بزووتنەوەی حەسەنی سەباح توێژینەوەی دەکرد. ڕوودانی شەڕی دووهەمی جیهانی سەرنج و هۆگریی ناوبراوی بۆ لای مێژووی هاوچەرخی ڕوهەلاّتی نێوەڕاست ڕاکێشا و، لێکۆڵێنەوەکانی خۆی لە سەر مێژووی ئیمپراتۆریی عوسمانی چڕ کردنەوە. ناوبراو ئێستا هەوڵدەدا بە تێکەڵکردنی هەموو ئەو باسانە، دەست بداتە هەڵسەنگاندنی مێژووی پێوەندیی نێوان ئیسلام و ئەورووپا.

بەرهەمە گرینگەکانی ناوبراو بریتین لە:

١- عەرەبەکان لە درێژایی مێژوودا، لەندەن، ١٩٥٠.

٢- پێویستیی تورکیای نوێ، لەندەن و نیویۆرك، ١٩٦١.

٣- حەشاشین، لەندەن، ١٩٦٧.

٤- دۆزرانەوەی ئەورووپا لە سەر دەستی موسڵمانەکان، نیۆیۆرك،١٩٨٢.



٥- زمانی سیاسیی ئیسلام، شیکاگۆ، ١٩٨٨ .

٦- لێکدانەوەی مێژوویی ڕەگەزپەرستی و کۆیلەداری لە ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا، نیۆیۆرك، ١٩٩٠.

٧- ئیسلام و ڕۆژئاوا، نیۆیۆرك، ١٩٩٣.

٨- ئیسلام لە درێژایی مێژوو دا، چاپی دووهەم، نیۆیۆرك، ١٩٩٣.

٩- شکڵ گرتنی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاستی نوێ،نیۆیۆرك، ١٩٩٤.

١٠-ناکۆکیی کەلتووره کان، نیۆیۆرك، ١٩٩٤.

١١-ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست: کورتەیەك لە مێژووی دوو هەزار ساڵی ڕابردوو، نیۆیۆرك، ١٩٩٥.

١٢-داهاتووی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست، لەندەن، ١٩٩٧.

١٣-ناسنامەی فره لایەنی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست، لەندەن، ١٩٩٨.

١٤-فرەڕەنگیی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست: چەندین باس لە ژیان، نامەکان و مێژوو، نیۆیۆرك، ٢٠٠٠.

١٥-هەڵەکە لە کوێ دایە؟ کاریگەریی ڕۆژئاوا و وەلاّمی ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست، ڕووداوی ١١ ی سیپتامبەر، ٢٠٠٢، نیۆیۆرك، دەزگای بلاّوکردنەوەی زانکۆی ئۆکسفۆرد.





## پێشەکی نووسەر

ئەم کتێبە لە سەر بنەمای دەرس گوتارەکانی(موحازەرەکان) " میرل کورتی"[*] لە زانکۆکانی ڤیسکانسین و مادیسۆن لە مانگی مایسی١٩٩٣دا نووسراوە. من لەو دەرس گوتارانەدا بە بۆنەی پێنجسەدەمین ساڵوەگەڕی دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا، لە ساڵی١٤٩٢، روانگە و خوێندنەوەی جیاواز و دژبەیەك لەبارەی ئەو رووداوەم لێکداوەتەوە. مەبەستی من ئەوە بوو کە سەرنجی بیسەران بۆ رووداوەکانی تری ئەو ساڵە و بەتایبەتی سەرکەوتنی مەسیحییەکان لە غەرناتە، دوایین پێگەی عەسکەریی موسڵمانەکان لە نیمچە دورگەی ئیبریا[**] و، چەند مانگ دوای ئەمەش دەرکردنی جوولەکەکان لە سەرانسەری ئیسپانیا رابکێشم و نیشانی بدەم کە ئەو رووداوە بە رواڵەت جیاوازانە چەندە پێوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. پاشان ئەو سێ بابەتەی سەرکەوتنی مەسیحییەکان، دەرکردنی جوولەکەکان و دۆزینەوەی ئەمریکا لە پانتایەکی بەرفراوانتری مێژووی نێونەتەوەیی، نێوان ئایینی و نێوان کیشوەری لێك بدەمەوە.

سەرکەوتنی مەسیحییەکان بە سەر غەرناتەدا کۆتایی بە هەوڵی لەمێژینەی دووبارە ئەستاندنەوەی ئەوروپای رۆژئاوا هێنا و بواری بۆ دژەهێرشی گەورەی ئەوروپییەکان خۆش کرد، کە دەستپێکەکەی لەراستیدا، سەفەرە دەریاوانییەکانی ئیسپانیا و پورتوگال بوون.

مەسیحییەت تا ساڵی ١٤٩٢، لە هەموو نیمچە دورگەی ئیبریادا بڵاو ببۆوە بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە غەیرە مەسیحییەکانی وەك جوولەکە بە تایبەتی موسڵمانی لێمابوونەوە. دەرکردنی ئەوانە وەك بەشێکی گرینگ لە پرۆسێسی زاڵبوون بە سەر ئەو

(*) Merle Curti.

(**) کۆی دوو وڵاتی ئیسپانیا و پورتوگاڵ.



ناوچەیەدا، سەرەتا لە ئیسپانیا و دواتر لە پورتوگالەوە دەستی پێکرد. دەرکردنی جوولەکەکان کە کەمینەیەکی بچووکتر و لاوازتر بوون، بە خێرایی جێبەجێکرا" بەڵام دەرکردنی موسڵمانەکان کە حەشیمەتێکی گەورەتر و بەهێزتر و ئاڵۆزتر و مەترسیدارتر بوون، پێویستی بە کاتێکی زیاتر هەبوو.

هەر لەو کاتەدا، پێشرەوی ئەوروپییەکان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا بە مەبەستی کەمکردنەوەی رۆڵ و کارتێکەری ئیسلام کە چەندین سەدە درێژەی هەبوو، دەستی پێکرد. رووسەکان لە رۆژهەڵاتدا دوای شەڕێکی قورس و دوور و درێژ توانیان "تۆق یان نیری تاتارەکان" _ بە وتەی مێژوونووسانی خۆیان _ لە ملیان بکەنەوە. مەسیحییەکانی رۆژئاواش سەرەتا کۆتاییان بە دەسەڵاتی موورەکان[*] و پاشانیش بەئامادەبوونی هەشت سەدەیان لەو ناوچەیە، هێنا. مەسیحییەتی بوژاوە شەڕێکی قورسی لە هەر دوو بەرەی ئەوروپای رۆژهەڵات و رۆژئاوا بە دژی بەرەی دوژمن دەست پێکرد. رووسەکان لە لای رۆژهەڵاتەوە تاتارەکانیان هەتاکو تاتارستان راونا و دەستیان بە سەر ئاسیای ناوەندی و باکووری داگرت. ئیسپانی و پورتوگالییەکانیش لەرۆژئاوادا، وێڕای دەریاوانەکانی تر، موورەکانیان بەرەو ئەفریقیا و ئاسیا راو ناو، تەقریبەن بە رێکەوت ئەمریکایان دۆزیەوە و داگیریان کرد.

(*) ناوێك کە ئەوروپییەکان لە خەڵکی باکووری رۆژئاوای ئەفریقیایان نابوو.





بۆ زۆر لە ئەمریکی و ئەوروپییەکان و کەسانێك کە مێژوو لە مامۆستا و کتێبە ئەمریکی و ئەوروپییەکان فێربوونە، ساڵی ١٤٩٢بە ساڵی دۆزینەوەی ئەمریکا لە لایەن کریستۆف کۆلۆمبەوە دەناسن. ئەگەرچی هێندێك لە وڵاتان جێژنی ڕووداوەکانی دیکەی ئەو ساڵە دەگرن، بەڵام ئەوانیش لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە مێژووی جیهاندا دۆزینەوەی ئەمریکا —هەتا ماوەیەك لەمەوبەر-گرنگترین ڕووداوی ئەو ساڵە پڕ لە ڕووداوە بووە. بەنزیکبوونەوە لە ساڵی ١٩٩٢، پێنجەمین سەدەی دۆزینەوەی ئامریکا، ڕێوڕەسمێکی بەربلاو و کەم وێنە بۆ ڕێزگرتن لەو ڕووداوە لە شاری جەنوا (زێدی کۆلۆمب)، لە ئیسپانیا شوێنی وەڕێکەوتنی و لە سەرانسەری کیشوەری ئەمریکادا بەڕێوەچوو کە مێژووە نوێیەکەی بە شێوەیەکی گشتی لەگەڵ هاتنی ئەودا دەستپێدەکات.

بەڵام هاوکات لەگەڵ بەڕێوەچوونی ئەم ڕێوڕەسمانە، دەنگی دژایەتیش بە گوێ دەگەیشت کە شك وگومانی لە بنەمای ئەو بابەتە دروستدەکرد. ئەوان دەیانگوت کە واژەی "دۆزینەوە" گومڕاکەر و سووکایەتیکردنە. چونکە نیوەگۆی ڕۆژئاوا بەر لە هاتنی سپی پێستەکان هەبووە و هاتنی ئەوانیش بەرلەوەی شارستانیەتێکی نوێ بونیات بنێ, شارستانیەتە کۆنەکانی تاپۆ کردووە. خاکەکانی ئەوبەری زەریای ئەتڵەس زۆر بەر لەوەی کە لەلایان نەخشەکێشێکی ئیتاڵی بە ناوی "ئامریکۆ وێسپوچی"بدۆزرێتەوە کە ئەو شوێنە بە پێچەوانەی گومان و بۆچوونی ئەوروپییەکان ئاسیا نییە، هەبووە. ئەوان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەم ڕووداوە بۆنەیەك نییە کە جێژنی بۆ بگێڕێ لە ڕوانگەی قوربانییەکانەوە تەعزێ بارییە و لە ڕوانگەی تاوانبارانیشەوە پەشیمانی و عەزابێکی ویژدانی بەدواوەیە.

تەنانەت خودی کریستۆف کۆلۆمب، قارەمانی گریمانەیی ئەو ڕووداوە، ناتوانێ لە دەستی دووبارە پێداچوونەوەی مێژوو دەرچێت. لە پێداچوونەوەیەکی دووبارە کەسایەتی و پاڵنەرەکانی ناوبراو وەك تێکەڵاوییەك لە کەسایەتییەکانی ئاتیلا،



چەنگیز و هیتلەر بەچەشنیی"ئاڵ کاپوون" دێنە بەر چاو. بەڵام بەو حاڵەش، ناوبرا بە نوێنەری ڕاستەقینەی گەشەی ئەورووپای ڕۆژئاوا دەژمێردرێ کە لە سەدەی پازدەیەمەوە نزیك بەتەواوی جیهانی خستە ژێر دەسەڵاتی شارستانیەتی ئەورووپا یان بەلانی کەمەوە ژێر کاریگەریی ئەم شارستانێتییە.

ئەوانەی شارەزای بیرکردنەوەی مۆدێرندا دەزانن کە لە فراوانخوازیی ئەورووپای ڕۆژئاوادا بنەما ڕەوشتییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو لە بیر کرابوون، بەشێوەیەك کە لە زێدەخوازییەکانی گەلی وەك مەغوولەکان، هوونەکان، عوسمانییەکان، عەرەبەکان، ئازتەکان و تەنانەت ڕووسەکانیش کە لە دەریای باڵتیك هەتا زەریای ئارامەوە کەوتە ژێردەستیان، ئەم تایبەتمەندییە واتە لە ژێرپێنانی بنەما ڕەوشتییەکان، بەدی نەدەکرا.

دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە گەشەی ئەورووپا لە چاخی نۆیدا هەم لە ڕۆژهەڵات و هەم لە ڕۆژئاوادا ڕوویدا. وڵاتە ئەورووپییەکان لە ململانێی یەکتردا پێشڕەویان بۆ لای ئەمریکا، ئەفریقیا، باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کرد. ڕووسەکان بە نێو ستێپسەکاندا هێرشیان بۆ لای دەریای ڕەش، دەریای خەزەر، ئاسیای نێوەڕاست و سنوورەکانی چین کرد.

ئەورووپییەکان لە پێشڕەوەییەکانی خۆیاندا زۆرجار دەگەیشتنە سەرزەویی ئەوتۆ کە هەروەك ئەو شوێنانەی هیچ دانیشتوویەکیان لێنەبێ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرا؛ بەواتایەکی وردتر، ئەو سەرزەوییانەی کە جگە لە حەشیمەتێکی بەگشتی چادرنشین شتێکی تری لێنەبوو. هەر لەم جۆرە سەرزەمینانەدا بوو ئەورووپییەکان لە ڕێگای داگیرکردن و نیشتەجێکردن توانیان کۆمەڵگا ئینگلیزی و فەرەنسیی زمانەکانی ئەمریکای باکوور و کۆمەڵگای ڕووسیی ئاسیای باکوور پێکبێنن.

فەرەنسییەکان لە ئەفریقیای باکوور و ئینگلیزییەکان و هۆڵەندییەکانیش لە ئەفریقیای باشوور کارێکی لەم شێوەیان ئەنجامدا، بەڵام نەیانتوانی ئەوشوێنانەی کە داگیریان کردبوو بۆ هەمیشە بپارێزن.





بەڵام لە سەرزەمینەکانی دیکەدا، ئەورووپییەکان لەگەڵ شارستانیەتە هەبییەکان بەرەوڕوو بوونەوە و شەڕیان لەگەڵدا کردن. پێنج وێنە لەو بەریەککەوتنانە گرنگییەکی زیاتریان هەیە. ئەمریکای باکوور و باشوور لە نیوەگۆی ڕۆژئاوا و چین و هیند و جیهانی ئیسلام لە نیوەگۆی ڕۆژهەڵات کە ڕووبەری گەشە و دەسەڵاتەکەیان هەموو ئاسیا و بەشێکی زۆر لە ئەفریقیای گرتەوە، بە توندی کەوتنە ژێر کاریگەریی تێکدەرانەی ئەورووپای زێدەخوازەوە.

ئەمریکاش هەر وەك بابەتگەلێکی تری هاوشێوەی ئەمە لە لایەن دۆزەران و بازرگانانەوە دۆزرایەوە. ئیسپانییەکان و ئەوانەی کە شوێن پێی کۆلۆمبیان درێژە پێدا، لە سەردەمی خۆیدا ناویان بە داگیرکەرانی دونیای نوێ دەرکرد. ئەم داگیرکردنە نە بە دۆزینەوەی ئەمریکا دەستیپێکرد و نە بەم دۆزینەوەش کۆتایی پێهات؛ بەڵام بەشێك بوو لەم ڕەوتە گەورەیە کە چەندین سەدە بەر لە سەفەری کۆلۆمب دەستیپێکردبوو و چەندین سەدەش دوای ئەمە درێژەی کێشا. ساڵی ١٤٩٢ بە داگیرکردنی غەرناتە دەستیپێکرد.

لە دووهەم ڕۆژی کانوونی دووەمی ئەم ساڵەدا هێزە هاوبەشەکانی دەسەڵاتدارانی کاتۆلیك، فردیناند لە بنەماڵەی ئاراگۆن و ئیزابێل لە بنەماڵەی کاستیل چوونە نێو غەرناتە —واتە ئاخرین شوێنی بە هێزی موسڵمانان لەئیسپانیادا - بە سەرکەوتنیان لەوشەڕەدا کۆتاییان بە هەشت سەدەی شەڕی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت لەسەر دەست بەسەرداگرتنی نیمچە دورگەی ئیبێری هێنا. ئەمە یەکەمین ڕووداوی گرنگی ئەم "ساڵە باشە" بوو بۆ فەلەکانی ئیسپانیایی. هەروەها ئەم ڕووداوە ئەو مەرجە پێویستە بوو کە بە بێ ئەو، ڕووداوەکانی دووهەم و سێهەم نەدەکرا ڕووبدەن.

ڕووبەڕووبوونەوەی ئەورووپا لەگەڵ ئیسلام، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کیشوەرە لەگەڵ چین و هیند لە هەر دوو لاوە جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە. ئەورووپییەکان لە سەدەی پازدەدا زانیارییەکی ئەوتۆیان لە سەر چین و هیند نەبوو. زانیارییەکی ناتەواو لە بارەی سەردەمی یۆنان و ڕۆما مابووەوە. گەشتیارەکان و بازرگانان بە دوو پاڵنەری





بەهێزی ئیمان و تەماح — بەهێزترین پاڵنەرەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، بە تایبەتی ئەگەر تێکەڵ بن— مەترسییەکانی سەفەریان بۆ ئەم شوێنە دوورەدەستانە قبووڵکردووە و بە کۆمەڵێك چیرۆکی سەیر، لەو شتانەی کە بینیویانە و بیستوویانە، گەڕاونەتەوە. چین و هیند بۆ ئەوان هیچ نەبوو جگە لە ناوە موڕادیفەکان بە شت و مەکە تایبەتییەکان، واتە هیچ زانیارییەکی ورد و هیچ تێڕامانێکی سەقامگیر بۆ ئەم لایەنانە لە ئارادا نەبوو. چینییەکان و هیندییەکانیش زانیارییەکی زۆر کەمتریان لە سەر ئەورووپا هەبوو، چونکە کەمتر کەس ورەی سەفەرکردنی بۆ ئەورووپا تێدا بوو و ئەگەریش هەبوایە ئەوا بە زانیارییەکی کەمەوە دەگەڕایەوە. خەڵکی ئەورووپا و نەتەوەکانی ئەمریکا، ڕەنگە بەختەوەرانە!! شتێکیان لەبارەی یەکترەوە نەدەزانی .

مێژووی پەیوەندییەکان و یەکترناسین و لێك تێگەیشتنەکانی نێوان ئەورووپا و ئیسلام بەتەواوەتی لێك جیاوازبوون. ئەورووپییەکان و موسڵمانەکان زانیارییەکی زۆر و هێندێك جار ڕاستیان لەبارەی یەکترەوە هەبووە. لەلایەکی دیکەوە، جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئیسلام و شارستانیەتەکانی چین و ڕۆژهەڵاتی دوور، هیندوباشووری ڕۆژئاوای ئاسیا و،- دەکرێ زیادی بکەین — شارستانیەتی ئەمریکای بەر لە چوونی کریستۆف کۆلۆمب هەرچەند پێشکەوتوو و ئاڵۆز بوون و کاریگەرییان لە سەر هاوسێکانیان دادەنا، بەڵام نەیانتوانی لە چوارچێوەی هەرێمی خۆیان دەربچن و لە چوارچێوەی کەلتوورێك و نەتەوەیەکدا مانەوە .

بەڵام ئیسلام لە باوەڕ و تێڕامان و ئامانجەکانییدا جیهانی بوو. موسوڵمانەکان خۆیان بە خاوەنی بەختەوەریی ئاخرین ئیلهامی خوا دەزانی و هەستیان بەوە دەکرد کە ئەرکی سەرشانی ئەوانە کە قسەکانی خوا بە گوێی مرۆڤەکانی تر بگەیەنن، تەنانەت ئەگەر ئەم گەیاندنە لە ڕێگای جیهاد وشەڕیشەوە بێ لەڕێی ئەودا. موسڵمانەکان وەك مەسیحییەکان لەسەرەتادا ئەرکێکیان لە سەرشانی خۆیان هەستپێدەکرد و هەتاکو کۆتایی سەدەکانی نێوەڕاست لە پراکتیزەکردنی ئامانجەکانیاندا بە شێوەیەکی بەرچاو وەپێش مەسیحییەکان کەوتنەوە . مەسیحییەت

سەرەڕای ئەوەی کە ئامانجی خۆی هەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە خۆی بە ئایینێکی جیهانی دادەنا بەڵام بەگشتی وەك ئایینی ئەوروپا مابۆوە و شەڕە ئایینییەکانی مەسیحییەت بۆ وێنە شەڕە سەلیبییەکان بەمەبەستی پاراستن یان سەرلەنوێ ئەستاندنەوەی سەرزەمینەکانی خۆی بەڕێوە دەچوون. لە دەرەوەی ئەوروپا —وەك ڕیزپەڕ- واتە تەنیا لە حەبەشەدا پادشایەکی مەسیحی هەبوو کە ئەویش بە هۆی دووری و نەناسراوبوونیی، هیچ کاریگەرییەکی لە سەر بزووتنەوەی مەسیحییەت نەبوو. بارودۆخی کەمینە مەسیحییەکانی وڵاتە ئیسلامییەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئاسیاش هەروەك ئەمەن. لەڕاستیدا هەروەك چۆن هیندۆئیزم تایبەت بە هیندوستان بوو، مەسیحییەتیش گرێدراوی ئەوروپا بوو. هیندۆئیزم ئایینی بەشێك لە جیهان بوو و ئەویش بەشێکی بچووك لە جیهان کە دانیشتووانەکەی خاوەنی ڕەگەز و کەلتوورێك بوون.

شارستانیەتی ئیسلامی یەکەم شارستانیەتێکە کە دەکرێ لەوبوارەیدا کە کەس و نەتەوە و کەلتوور و کیشوەرە جۆراوجۆرەکانی لەخۆ گرتبوو، بەجیهانی ناوبەرین. ئیسلام نەك تەنیا ئەفریقیایی و ئاسیایی بوو، بەڵکو لەو بوارەدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئیسپانیا و باشووری ئیتاڵیا و ستێپسەکانی ڕووسیە و نیمچە دورگەی باڵکاندا بوونی هەبوو بە ئەورووپیش لە قەڵەم بدرێ. لە رووی جوغرافییەوە، لە باشووری ئەوروپا هەتا ناوەندی ئەفریقیاو، لە ئاسیادا هەتا نزیك سنوورەکانی چین وهیند بڵاوببۆوە و ڕەگەزەکانی سپی و زەرد و ڕەشی لە خۆ دەگرت. ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەرەوە لە سەدەی حەوتەم لە عەرەبستاندا و پاشان دوای چوونی لایەنگرانی ناوبراو بۆ سەرزەمینەکانی دەوروبەری دەریای نێوەڕاست، هەمووکات وەك هاوسێ، نەیار و تەنانەت دوژمنی مەسیحییەت خۆی نواندووە.

دیارە بەر لە ئیسلام و مەسیحیەتیش ئایینێکی دیکە بەناوی بوودا هەبوو کە هەمان روانینی جیهانی هەبوو، بەڵام بوودائیزم لەمێژ بوو کە مەیلی بۆ پڕوپاگەندە کردن لە دەستدابوو: هەر بۆیە ببوو بە ئایینێکی ناوچەیی.



بە درێژایی ئەو قۆناغەی کە مێژووزانی ئەوروپی بە سەدەکانی نێوەڕاستی ناودەبەن، هەریەك لەو دوو ئایینە، واتە ئیسلام و مەسیحییەت، ئەویتری وەك رکابەری خۆی سەیر کردووە. پێشتر ئاماژەم بە دوو پاڵنەری بەهێزی باوەڕ و تەماح، کە ببوونە هۆی سەفەری دۆزەران و بازرگانان بۆ سەرانسەری دونیا، کردبوو. مەسیحییە ئەورووپییەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئیسلام پاڵنەرێکی بەهێزی دیکەشیان هەبوو کە ئەویش ترس بوو.

بۆ ماوەی نزیك بە هەزارساڵ، لە سەردەمی یەکەم هێرشی سوپای ئیسلام بۆ سەر زەوییە مەسیحی نشینەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای نێوەڕاست لە سەرەتای سەدەی حەوتەم هەتا دووهەمین وئاخرین پاشەکشەی تورکەکان لە شاری ڤییەنا لە ساڵی ١٦٨٣دا، مەسیحییەکانی ئەوروپا بە ترس لە ئیسلام دەژیان. یەکەم بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەسەر حیسێبی مەسیحییەت بەڕێوەچوو، چونکە سووریا و فەلەستین و میسر و باکووری ئەفریقیا مەسیحی بوون؛ یان ئەوەی کە بە شێوەی ئەیالەتێك لە ئیمپڕاتۆریی مەسیحیی ڕۆم یان وەك داگیرکراوی وڵاتێکی دیکەی مەسیحی بوون تا ئەوەی کە هاتنە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی ئیسلامی.

پێشڕەویی ئیسلام بۆ لای ئەوروپا نەك یەك جار بەڵکو سێ جار بە ڕێوە چوو. یەکەم شەپۆلی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەئەوروپادا بۆ ساڵەکانی یەکەمی سەدەی هەشتەم دەگەڕێتەوە و وڵاتانی ئیسپانیا، پۆرتوگاڵ، باشووری ئیتالیا و تەنانەت چەند بەشێك لە فەڕەنسا دەگرێتە خۆی، کە ئەم ڕەوتە هەتا ساڵی ١٤٩٢کە ئاخرین دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوروپای ڕۆژئاوا تێکدەشکێ و لێك هەڵدەوەشێ، درێژە دەکێشێ. شەپۆلی دووهەم ئەوکاتەیە کە مەغۆڵەکان دەست بە سەر ڕووسیە و بەشێکی زۆر لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات دادەگرن و دەبن بە موسڵمان و، مۆسکۆ و ئەمیرنشینەکانی دیکەی ڕووسیە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی میرێکی موسڵمان . ئەم قۆناغە بە هەوڵ وبەرگریی مەسیحییەکان و پاشەکشەی تاتارە موسڵمانەکان لە ڕووسیە، کۆتایی پێهات. شەپۆلی سێهەم کاتێك دەستپێدەکات کە تورکە سەلجووقی





وعوسمانییەکان، ئاناتۆلیان- کە سەر بە ئیمپیراتۆریێتیی بێزەنتی بوو- داگیر کرد و ئیمپراتۆرییەکی بەهێزیان لە نیمچە دوورگەی باڵکاندا دامەزراند. ئەوان لەماوەی پێشڕەویی خۆیاندا، دوای داگیرکردنی قوستەنتینییە، دووجار گەمارۆی ڤییەنایاندا. دزانی دەریایی بەربەر جیهادی خۆیان هەتا دوورگەکانی بریتانیا و تەنانەت ئیسلەندیش بەرەوپێش برد. تێکشکان و پاشەکشەی عوسمانییەکان لە دووهەمین گەمارۆی ڤییەندا سنووری نێوان ئەو دوو ئایین و شارستانیەتەی دیاریکرد.

هەڕەشەی هەزار ساڵەی ئیسلام بۆ سەر ئەوروپا هەم لایەنی عەسکەری هەبوو و هەم لایەنی ئایینیش واتە هەڕەشەیەك بوو بۆ داگیرکردنی ئەوروپا وگۆڕینی ئایینی ئەوروپا. ڕۆژئاوای ئێران،نیمچە دوورگەی عەرەبستان وبەشێکی زۆرلە ولاتانی ڕۆژهەلاتی دەریای نێوەڕاست وباکووری ئەفریقیا لە مەسیحییەوە ببوون بە ئیسلام .پرۆسێسی بوونە ئیسلام لە سیسیل و ئیسپانیاش درێژەی هەبوو. زانایانی مەسیحی لە سەدەکانی نێوەڕاستدا زۆریان هەوڵدابوو هەتاکو ئایینی رکابەرەکەیان بناسن و هەڵە بوونەکەی بسەلمێنن ولایەنگرانی خۆیان بپارێزن. لە سایەی ئەو نەرمییەی کە کۆمەڵگای مەسیحی و ڕێبەرەکانیی لەداوێنی ئیسلامدا فێری ببوون تا ڕادەیەکی زۆر لە مەسیحییەکان، ئایینی داگیرکەرانیان قبوولکرد.

ئەوروپییەکان هەمیشە لە موسوڵمانەکانی وەك موورەکان وبادوورەکان و تاتارەکان و تورکەکان لە ترس و دڵە ڕاوکێ دابوون. ئەوان هەمیشە لە شێعر و مێژوو و ئەدەبیاتدا لەبەرانبەر هەڕە شە و گەمارۆی جیهانی بە هێز و لە حاڵی بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا وەسفکراون. ئیسلام ئەوروپای لە ڕۆژهەڵات و باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتەوە گەمارۆ دابوو. بەپشت بەستن بە ئەدبیات و نووسینە ئیسلامییەکان، ئەوروپا لە ڕوانگەی موسڵمانەکانی سەدەکانی نێوڕاست شتێکی وەك ئەفریقیا یان ئاسیای ناوەندی بوو لە ڕوانگەی ئینگلیزییەکانی سەردەمی ویکتۆریا.[1]. لە ڕوانگەی موسوڵمانەکانەوە ئەو سەرزەمینانەی کە دەکەوتنە باکووری ڕۆژئاوای سنوورەکانی ئیسلام، سەرزەمینی ئاژەڵەکان بوو؛ واتە سەرزەمینێکی نەدۆزراوە و



دوورە دەست کە لەوێدا نەتەوەی سەیر و سەمەرە، بەخوو و ڕەوشتی پیس و پۆخڵ، کەلتوورێکی نزم و ئایینێکی پەککەوتە و خاوەنی شت و مەکە بێبەهاکان دەژیان؛ بەڵام پێیان وابوو کە خۆیان لە سیستەمێکی کۆیلەداریی خواییدا بە شارستانیەتێکی ئاست بەرزتر گەیشتوون. کەسانێکی زۆرکەم ورەی ئەوەیان هەبوو کە سەفەر بۆ تاریکترین بەشی ئەوروپا بکەن و سەفەرنامەکانیشیان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو. موسوڵمانەکان زانیاریان لە سەر ئەوروپای سەردەمی بێزەنتی هەبوو؛ شارستانیەتیی یۆنانی کۆن و شارستانیەتیی یۆنانییە مەسیحییەکانی بێزەنتیان —بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر — دەناسی و ڕێزیان لێدەگرت؛ بەڵام هیچ ڕێزێکیان بۆ ئەوروپای ناوەندی و ڕۆژئاوادا نەدەنا، چونکە شارستانیەتی ئەوروپا لە سەدەکانی نێوەڕاست بە بەراورد لەگەڵ ولاتانی ئیسلامیدا لەبواری ماددی و مەعنەوییەوە زۆر نزم بوو. بەڵام ئەوەشیان دەزانی کە وەك دانیشتووانی بەشێك لە ئاسیا و ئەفریقیا وەحشی نین، بەڵکو لایەنگری ئایین و سیستەمێکی سیاسین کە وەك ئەوان بانگەشەکەری پەیامێکی جیهانی و شەریعەتێکی جیهانگیرن بۆ هەموو مرۆڤایەتی. موسڵمانەکان دونیایان بەسەر دوو بەشی خانەی ئیسلام (دارالاسلام) کە لەودا ئایین وشەریعەتی ئیسلامی برەوی هەبوو و خانەی شەڕ(دارالحرب) کە لەو دا ئیسلام بڕەوی نەبوو، دابەش کردبوو. لە نێوان ئەو دوو بەشەدا هەمیشە شەڕێکی بەردەوام لە ئارا دابوو" تەنیا هەندێك جار ئاگربەسی کاتی مەودایەکی دەخستە نێوان شەڕەکانەوە. ئامانجی ئەو شەڕانە بڵاوکردنەوەی ناوی خوا بوو لە نێو مرۆڤایەتیدا. بۆ زۆربەی نووسەرە موسڵمانەکان، چۆارچێوەی ئیمپراتۆریی مەسیحییەت —سەرتا لە بێزەنتی وپاشان لە ئەوروپا — بەخانەی شەڕ دەژمێردرا.

لەنێوان ئیسلام و دونیای مەسیحییەتدا دوژمنایەتییەکی بەردەوام هەبوو. ئەو دوژمنایەتییە، بە پێچەوانەی باوەڕی باوی ئێستا، لێك تێنەگەیشتن نەبوو؛ ئەوان یەکتریان باش دەناسی، زۆرباشتر لەو ناسیاوییەی کە هەرکام لەوان لەسەر شارستانیەتە دووردەستەکانی تری ئاسیا و دواتر ئەمریکا بەدەستیانهێنا. ئەم دوو





ئایینە، جیا لەو ناکۆکییانەی کە لە سەر بەدەستهێنانی زەوی زیاتر و لایەنگرانی زیاتر هەیانبوو؛ میراتێکی هاوبەشیشیان هەبوو کە بریتی بوو لە زانست و فەلسەفەی یۆنان، یاسا و دەوڵەتداریی ڕۆم، ڕەوشتی خوایی جوولەکە و کۆنتر لە هەمووی ئەمانەش کەلتووری ڕیشەداری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی کۆن. مەسیحییەکان و موسڵمانەکانی دەوروبەری دەریای نێوەڕاست دەیانتوانی لە نێوان خۆیاندا زمانێکی هاوبەش، چ لە دەربڕیندا و چ لە مانادا، بدۆزنەوە. دەیانتوانی لە گەڵ یەکتر پەیوەندی پێکبێنن و لە گەڵ یەکتر وتووێژ بکەن، هەرچەندە نەیاندەتوانی بە ڕێککەوتنێك بگەن. ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە پەیوەندییەکی لەمجۆرە لەگەڵ شارستانیەتەکانی چین و هیند بۆ هەریەك لەوان ئەگەر نامومکین نەبوایە لانیکەم زۆر دژوار بوو. ئەگەرچی ئەوان یەکتریان بە کافر ناو دەبرد، بەڵام حاشایان لە خاڵە هاوبەشە بنەڕەتییەکان و تەنانەت نزیکایەتیی خۆشیان نەدەکرد. هەردوولا بانگەشەیان بۆ ئەمە دەکرد کە پەیامهێنەری راستییەکان و ئاخرین قسەکانی خوای مەزنن و ئەرکی سەرشانی ئەوانە کە دەبی بە سەرانسەری جیهانی بگەیەنن. ئەوان بۆ بە جێهێنانی ئەم ئەرکەی خوا چاوەڕوانی پاداشتی قیامەت و بەختەوەریی ئەم دونیایە بوون و نەیارانیش تووشی شکەنجەی دونیا و قیامەت دەبوون. مەسیحییەکان و موسڵمانەکان تاڕادەیەك باوەڕی وەك یەکیان لەبارەی داوەری و سزا و پاداش لەقیامەتدا هەبوو. بەهەشتەکەیان بەشێوەیەکی بەرچاو جیاوازی لەگەڵ یەکتردا هەبوو بەڵام جەهەننەمەکەیان تا ڕادەیەکی زۆر وەك یەك وابوو. بەڵام هاوبەشییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئایینەکانی هیند و بودایی و کۆنفۆسیۆسدا نەبوو.

تا ڕادەیەك لە هەموو راپۆڕتە مێژووییە نوێیەکاندا، ڕەوتی گۆرانکارییەکان لە قۆناغی کۆنەوە دەستپێدەکەن، لە سەدەکانی نێوەڕاست تێدەپەڕن و بە قۆناغی نوێ دەگەن. قۆناغی کۆن بە مێژووی ئەو سەرزەوی و خەڵکانە دەستپێدەکا کە ناویان لەتەوڕاتدا ئاماژەی پێکراوە. ئەم قۆناغە بە شارستانیەتی یۆنان و ڕۆم دەگاتە لوتکە و بە ڕووخانی ئیمپراتۆریی ڕۆم لەگەڵ رۆژئاوادا کۆتایی پێدێت. قۆناغی نوێ لە



کۆتاییەکانی سەدەی پازدەیەمەوە دەستپێدەکا، واتە ئەوکاتەی کە ئەوروپا لە حاڵی بووژانەوە و گەشە کردندا، قوناغ و شارستانیەتێکی نوێ دەخاتە ڕوو کە پاشان سەرانسەری جیهان دادەگرێ. سەدەکانی نێوەڕاست وەك دەسکی دەمبڵ ماوەی نێوان ئەو دوو شارستانیەتە گەورە و شکۆمەندە بوو.

بەڵام سەدەکانی نێوەڕاست بە تەنیا رێگەی پەیوەندیی نێوان قۆناغی کۆن و نۆی نییە. لە ڕاستیدا، شارستانیەتی ئیسلامی لە قۆناغی یەکەمی خۆیدا زیاتر وا وێدەچی کە ئەرکی گواستنەوەی لە قۆناغی کۆنی هاوبەشەوە بۆ قۆناغی نوێی جۆراوجۆریی لە ئەستۆ بووە. بەراوردی سەدەکانی نێوەڕاستی مەسیحییەت و سەدەکانی نێوەڕاستی ئیسلامی بە باشی ئەوە دەردەخا کە جیهانی ئیسلام ڕەوگەیەکی باشتری لە شارستانیەتی کۆن بۆ شارستانیەتی نوێ پێواوە. دونیای ئیسلام بەربڵاو و دەوڵەمەند بوو. ناوچەیەکی بەربڵاوی بە خەڵکانی جۆراوجۆر و سەرچاوەی گەورەوە لە بەردەست دابوو. وەکو مەسیحیەتی ڕۆژئاوا لە میراتی شارستانیەتی یۆنانی کۆن بەهرەی وەرگرتبوو. بەڵام بە دەست بەسەرداگرتنێکی زیاتر بە سەر زانست و فەلسەفەدا[٢]، میراتی زانستیی خۆی لە ڕێگای پەیوەندیی لە گەڵ شارستانیەتەکانی دیکە، هەروەها بە پشت بەستن بە هەوڵەکانی خۆی، دەوڵەمەندتر کردبوو. بۆ وێنە، هێنانی کاغەز وکاغەزسازی لە چین و وەرگرتنی ژمارەی سفر و ژمارەنووسی لە هیند، بە چەندین سەدە بەر لە ئەوروپا ڕێگای بۆ بووژانەوەی زانستی و ئەدەبی لە ئاسیادا خۆشکرد. لەبەرانبەردا، ئەوروپای مەسیحی لە بواری سەرچاوەوە هەژار بوو؛ تێڕوانینێکی بەرتەسك و ناوچەیی هەبوو کە لە زۆر لایەنەوە نزمتر لە ئاستی دەسکەوتەکانی ئیسلام بوو.

جیاوازیی دیکەش هەبوو. ئەوروپا لە سەدەکانی نێوەراستدا خاوەنی پانتایەکی کەم و تێڕوانینێکی بەرتەسك و تەحەمولێکی کەم بوو. ئەوان نەك تەنیا ئایینەکانی دیکە بەڵکو مەزهەبەکانی دیکەی مەسیحییەتیشیان تەحەمول نەدەکرد. بەڵام ئیسلام تێکەڵاوییەکی جۆراوجۆر و تایبەتمەندییەکی زۆرینەگەرای هەبوو. موسڵمانەکان





ناكۆكییە بەرچاوەكانی باوەڕ و كردەیی خۆیانیان تەحەمول دەكرد. ئەوان تەنانەت ئامادە بوون كە لە كۆمەڵگادا جێگایەكی تایبەتی بۆ ئایینە لاوەكییەكان دابین بكەن[٣]. لە قۆناغی نوێدا زۆر جار ئەم ڕاستییە —بە هەڵە— بە یەكسانی ناوبراوە. دیارە ئەمە ناكری بە یەكسانی لەقەڵەمبدرێ چونكە ئەم جۆرە یەكسانییە لە كۆمەڵگای سەدەكانی نێوەڕاستدا ناعەقڵانی و لە گەڵ سەردەم نەگونجاوە. بەخشینی مافی یەكسانی لە لایان موسڵمانەكانەوە بە كافرەكان، لە هەر دوو بەری دەریای نێوەڕاستدا، بە باش و پەسند دانەدەنرا و بە لادان لە ئەركە ئایینیەكان دەژمێردرا. بەڵام بەو حاڵەش كۆمەڵگای ئیسلامی تەحەمولی لە خۆی دەنواند: جۆرێك لە مەیلداری بۆ هاوژیانی لەگەڵ لایەنگرانی ئایینەكانیتر. ئەوان ئەگەرچی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئیسلامدا چەندین بەربەستیان هەبوو، بەڵام لە بەڕێوەبردنی كاروباری ژیان و كردە ئایینیەكاندا سەربەست بوون. تەحەمولێكی ئەوتۆ لە چوارچێوەی دەسەڵاتی مەسیحییەتدا بوونی نەبوو. هەتا ئەوكاتەی كە شەڕە ئایینیەكان، لەئاكامدا مەسیحییەكانی هێنایە سەر ئەو باوەڕە كە كاتی ئەوە هاتووە خۆیان سەربەست بژین و لێبگەڕێن كە كەسانی دیكەش سەربەستانە بژین. بەدرێژایی ئەو هەشت سەدەیەی كە موسڵمانەكان دەسەڵاتیان بە سەر نیمچە دوورگەی ئیبێریدا هەبوو،مەسیحییەكان و جوولەكەكان لە پاڵ موسڵمانەكاندا مانەوە و گەشەیان كرد. كەچی لەحاڵێكدا دوای داگیر كردنەوەی ئەم نیمچە دوورگەیە لە لایان مەسیحییەكانەوە، بارودۆخی جوولەكە وموسوڵمانەكان بەرەو خراپی ڕۆیشت.

ئەورووپا تەنیا لەیەك بواردا جۆراوجۆریی ئاشكرای لە خۆی نواند كە ئەویش لە بواری زمانەوە بوو. لە سەرانسەری باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا و باكووری ئەفریقیا تەنیا زمانی عەرەبی وڵامدەری پێویستییە ئایینی و یاسایی و بازرگانی و كەلتووری و دەوڵەتی و زانستییەكان بوو. لەحاڵێكدا كە زمانە ناوچەییەكان بەڕادەیەكی زۆر لە زۆر لە وڵاتە جیاوازەكاندا قسەیان پیدەكرا، بەڵام زمانی عەرەبی وەك پێوەر لە نووسیندا، تەنیا كەرەستەی پەیوەندیی زانستی و كردەیی وڵاتە عەرەبییەكان و تەنانەت هەموو



وڵاتانی جیهانی ئیسلامیش بوو. ڕەشیدەددین، مێژووزانی گەورەی ئێرانی لە سەدەی چواردەهەمدا، بە سەرسووڕماوییەوە ڕادەگەیەنێ كە لە فەرەنسادا خەڵك بە بیست و پێنج زمانی جیاواز قسە دەكەن و هیچ كامیان زمانی یەكتر نازانن[٤].

بەڵام بەو حاڵەش، ڕێگایەك كە بەرەو پێشەوە چوو، ڕێگای ڕۆژئاوا بوو نەك ڕێگای ئیسلام. هەتا كۆتایی سەدەی چواردەهەم گۆڕانكاریی گرینگ لە دونیای مەسیحییەت و ئیسلامدا ڕوویان دابوو كە بە پێشكەوتنی یەكەمی (مەسیحییەت.) و بەدواكەوتنی دووهەمی (ئیسلام.و) كۆتایی هات. شەڕی نێوان ئەم دووانە تاڵ و دووردرێژ بوو. چەندین سەدەی پێچوو هەتاكو دەرەنجامی شەڕ بۆ لایەنەكانی شەڕ ڕوون بۆوە. لەبارەی هۆكارەكانی پێشكەوتنی ڕۆژئاواوە چەندین لێكۆڵینەوە ئەنجام دراون، بەڵام لەبارەی هۆكارەكانی دابەشبوون و لەگڕ و تین كەوتنی هێزی ئیسلام لێكۆڵینەوەیەكی ئەوتۆ نەكراوە.

جیاوازیی لەڕادەبەدەری ئەو دوو لایەنە لە بوارەكانی شەڕ و كاڵای شەڕ زووتر دەركەوت. سوپای ئیسلام لە سەرەتادا توانای بە چۆك داهێنان و لەنێوبردنی هەرجۆرە هێزەكی هەبوو.ئەوان هەتا نزیك سنوورەكانی چین چوون. سەرانسەری باكووری ئەفریقیا هەتاكو مەراكیشیان داگیر كرد و هەتا ناخ و دڵی ئەورووپا چوونە پێش. خودی ئەم بەربڵاوییە زیاتر لە بەرگریی دوژمنان هێزی عەسكەریی موسڵمانەكانی وردە وردە كەم كردەوە و تووشی وەستانی كرد. چەكی ئەوان لە هی دوژمنەكانیان كۆنتر نەبوو بەڵكو تەنانەت نوێتر و پێشكەوتووتریش بوو.بۆ نموونە ئەوان دەیانتوانی بۆ كەرەستەی تەقینەوە كەڵك لە نەوت —كە لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا زۆربوو- وەربگرن. ئەم كەرەستانە لە قاپێكی تایبەتی وەك مەنجەنیقدا لە هێزی دەریایی و هێزی پیادەدا كەڵكی لێوەردەگیرا. دیارە ڕەنگە زرێی تایبەتی و كەرەستەی گەمارۆی موسوڵمانەكان وەك هی مەسیحییەكان باش نەبووبێ، بەڵام هێزی فێربوونی ئەوان لە ئاستێكی بەرز دابوو.





جیهاد، یان شەڕ لە پێناوی باوەڕدا کە ئیلهامبەخشی موسوڵمانەکان بوو، بۆ مەسیحییەکانی بێزەنتی شتێکی نەناسراو نەبوو. ئیمپڕاتۆر هراکلیوس (٦١٠-٦٤١) شەڕ لەگەڵ ئێرانییەکانی بە جیهاد ڕاگەیاندو، لە بارەی "نیکە فوروس فوکاس "ە وە (٩٦٣-٩٦٩) کە باکووری سووریای لەدەستی موسڵمانەکان دەرهێنا، دەگوترێ کە دوای ئاشنابوون لەگەڵ هێزی جیهادی موسڵمانەکان خوازیاری حوکمێکی لەمجۆرە بۆ مەسیحییەکان بووە. نووسەرانی بێزەنتی زۆرجار بە هەڵە پاڵنەری ئەو شەڕە بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی زیاتر لە قەڵەمدەدەن، تاکو تەکلیفی شەرعی. بیری شەڕێکی مەسیحیی پیرۆز — بە کەمێك دواکەوتنەوە- وڵامێکی باشتری لە نێو مەسیحیەتی ڕۆژئاوادا پێدرایەوە. دوای هێرشی عەرەبەکان بۆ سەر ڕۆم و ئووستیا لە ساڵی ٨٤٦دا، شوورای کەنیسە لە فەرەنسا کۆبوونەوەیەکی پێکهێنا و لەم کۆ بوونەوەیەدا داوای لە پاشاکانی وڵاتە مەسیحییەکان کرد کە سوپایەکی هاوبەش بە سەرکردایەتیی فەرەنسا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنانی مەسیح پێکبێنن. پاپا لۆیی چوارەم، ڕەنگە لە ژێر کارتێکەریی ئیسلامدا، موژدەی پاداشتێکی ئەبەدی بە کوژراوەکانی ئەو شەڕەدا . چەند دەیە دوای ئەمە، پاپا ژانی هەشتەم (٨٧٢-٨٨٢) لەوڵامی داخوازیی قەشەکانی خۆیدا ڕایگەیاند کە گوناه و تاوانی هەموو ئەو کەسانە دەبەخشرێن کە لە بەرگریی کەنیسەی پیرۆز و دەوڵەتی مەسیحیدا ڕاپەڕن و لە شەڕ لەگەڵ کافرەکاندا بکوژرێن [٥] .

تەنانەت لە ڕۆژئاواشدا بەدەنگەوەهاتنی جیهاد بۆ بەرگریی لە مەسیحیەت لەسەرەخۆ و هەتا ماوەیەك بێ ئاکام بوو. گوڕانکاریی بنەڕەتی لە نیوەی دووهەمی سەدەی یازدەهەمەوە دەستیپێکرد. لە ساڵی ١٠٦١دا نۆڕمانەکان ئەسینایان داگیر کرد و بۆ دووبارە داگیرکردنەوەی سیسیل پێشڕەوییان کرد. لە ساڵی ١٠٨٥دا بە داگیرکردنی تۆڵدۆ (تلیتله) لە لایان ئاڵفۆنسۆی شەشەمەوە ڕێگەی گەیشتن بە نیمچە دوورگەی ئیبێری تەخت بوو. دوای چەند پاشەکشە، سەرکەوتنی شکۆمەندی مەسیحییەکانی لە "لاس ناواس دی تۆلۆسا"لە ساڵی ١٢١٢دا پشتی موسوڵمانەکانی لە ئیبێریدا شکاند. تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ئەیالەتە موسوڵماننشینەکان مابوونەوە کە ئەویش وردە وردە



کەوتنە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەتی لە حاڵی پێشڕەویدا. غەڕناتە ئاخرین ئەیالەت بوو. هاوتەریب لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە، لە ساڵی ١٣٨٠دا "دمیتری دانیسکۆ"ی پاشای مۆسکۆ لە شەڕ لەگەڵ تاتارەکاندا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا . لە ئاکامدا هەیوانی سێهەم ناسراو بە "هەیوانی گەورە" دوای شەڕێکی قورس و درێژ و تێکشکاندنی ئاخرین هێرشی تاتارەکان بۆ سەر مۆسکۆ لە ساڵی ١٤٨٠دا کۆتایی بە داگیرکاریی لە مێژینەی موسڵمانەکان هێنا .

مەسیحییەکان گرفتی زۆریان هەبوو بۆ دووبارە دەست بەسەر داگرتنەوەی سەرزەوییەکانی خۆیان. شەڕە سەلیبییەکان- کە ئەمڕۆکە زۆر جار بە یەکەم هێرشی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوای ناودەبەن — دەکرێ لە سەردەمی خۆیدا بە بەشێك لە چالاکییەکانی دووبارە دەست بەسەرداگرتنەوە بزانرێن، هەر بەو پاڵنەرانە و لە دژی هەمان دوژمن. ئەوە ڕوونە کە مەسیحییەت لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا کۆنتر و ریشەدارتر بوو هەتاکو لە باشووری ئەوروپادا. شەڕە سەلیبییەکان — وڵامی بەکاوەخۆی مەسیحییەت بە جیهادی موسوڵمانەکان- هەوڵێك بوون تاکو لەرێگای شەڕێکی ئایینییەوە ئەو شتانەی لە شەڕێکی ئایینیی دیکەدا لە دەستیان دابوو بەدەستبێننەوە. بۆمەسیحییەکان چ شتێك دەیتوانی لەوە گرینگتر بێ کە سەرزەوییە پیرۆزەکانی خۆیان، کە لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریی بێزەنتی لە سەدەی حەوتەمدا کەوتبوونە دەستی موسوڵمانەکان، وەربگرنەوە. مەسیحییەکان توانیان سەرزەوییەکانی ئیبێری و ڕووسیا بەدەست بیننەوە بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی دەریای نێوەڕاستدا کە لە ژێر دەسەڵاتی هێزە تازە نەفەسەکانی تورك دابوو، تووشی تێکشکان هاتن. ئەو بەرگریکارە نوێیانەی ئیسلام بەگەمارۆدانی ئاناتۆلی، کە سەردەمێك لەدەستی یونانییە مەسیحییەکاندا بوو، سیهەمین گورزیان لە ئەوروپا وەشاند.

بەڵام سەرەڕای سەرکەوتنەکانی تورکەکان، ناکۆکیی نێوان موسڵمانەکان و مەسیحییەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە بەرژەوەندیی مەسیحییەت دابوو. سەرکەوتنی مەسیحییەکان تا ڕادەیەکی زۆر بەهۆی چەکی باشتر و تەکنیکی لەبارتر لەلایەك و

پشتیوانەی ئابورییەکی بەهێز تر لە لایەکی دیکەوە، بوو. باڕووت کە لەرۆژهەڵاتی دووردا بۆ ئاگربازی دۆزرابۆوە، دوای تیپەڕین لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاست، لەئەوروپادا بۆ چەکسازی کەڵکی لێوەرگیرا. ئەم پێشکەوتنەی ئەوروپییەکان بووە هۆی باڵادەستیی عەسکەریی ئەوان بەرانبەر شارستانیەتە گەورە کۆنەکان و ئیمپراتۆریی ئیسلام .

هێندێك لەوڵاتە ئیسلامییەکان یان هیچ کەڵکیان لە چەکی گەرم وەرنەگرت یان زۆر بەکەمی کەڵکیان لێوەرگرت[٦]. بۆ نموونە، سوڵتانە بەهێزەکانی میسر بە چاوێکی سووك سەیری چەکی گەرمیان دەکرد و تەنیا لە یەکە بچووکەکاندا کەڵکی لێوەردەگیرا. کەوایە هیچ جێگای سەرسووڕمان نییە کە ئەم سوڵتانانە نەیانتوانی لە بەرانبەری پورتوگالییەکاندا کە لە باشوورەوە و عوسمانییەکان کە لە باکوورەوە هێرشیان دەهێنا، خۆڕابگرن. "ابن زنبل"، مێژووزانی میسری، دوای شکستی میسرییەکان لە بەرامبەر عوسمانیەکاندا بەم شێوەیە باس لە روانگەی میسرییەکان دەکا: پادشایەکی میسرییەکان کە لە لایان عوسمانییەکانەوە دیل دەکرێ ئاوا لەگەڵ سوڵتان سەلیمدا دەدوێ:

"ئێوە سوپایەکی تێکەڵاوتان لە مەسیحی و یۆنانی و موسوڵمانەکان وهیتر پێکهێناوە و ئەم چەکە نوێیەتان کە ئەوروپییەکان دوای تێکشکانەکانیان لە بەرامبەر سوپای ئیسلامدا دایانهێناوە داونەتەدەست. بەو چەکە تەنانەت ژنێکیش دەتوانێ چەندین پیاو بکوژێت. ئەگەر ئێمەش کەڵکمان لەو چەکە وەرگرتبا، ئێوە هیچکات نەتاندەتوانی ئێمە تێکبشکێنن. بەڵام ئێمە خەڵکانێکین کە هیچکات واز لە سوننەتی پێغەمبەر کە جیهاد لە رێگای خودا بە شەمشێر و سەرنیزەیە، ناهێنین. ڕووڕەشی بۆ ئێوە کە بەو چەکە کەسانێکتان کردۆتە ئامانج کە شایەدیان بۆ یەکتایی خوا و ریساڵەتی پێغەمبەر داوە."[٧]

لە نێو دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا تەنیا عوسمانییەکان بە شێوەیەکی تەواو و کاریگەر کەڵکیان لە تفەنگ و تۆپ وەردەگرت. بەڵام بەوتەی "ابن زنبل" تەنانەت عوسمانییەکانیش بۆ رێنماییکردنی تۆپخانەکانی خۆیان بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر



پەیوەست بوون بە داهێنانە نوێیەکانی رۆژئاوا و مەسیحییە بە موسڵمانبووەکان و سەربازە ئەوروپییە بەکرێگیراوەکان.

رۆژئاوا لە دەریاشدا لە موسڵمانەکان بەهێزتر بوو. کەشتییە زەریا بڕەکانیان لە کەشتییەکانی موسڵمانەکان گەورەتر و بەهێزتر بوون، کە ئەوکەشتییانە بۆ هاتوچۆ لە دەریای سوور و دەریای نێوەڕاستدا سازکرابوون. کەشتییە ئەوروپیەکان توانای جووڵەی زیاتریان هەبوو، دەیانتوانی ماوەی زیاتر ببڕن،گرینگتر لە هەر شتێکی دیکە، ئەو کەشتیانە توانای هەڵگرتنی چەکی زۆر قورستریان هەبوو. کەشتییەکی گالیۆنی ئیسپانی و کەشتییەکی کاراکی پورتەگالی لە گشت کەشتیەبازرگانی و سەربازییەکانی موسڵمانەکان باشتر بوو،بەڵام خودی ئەوانیش بۆ خۆیان تووشی تێکشکان دەبوون لە بەرامبەر ئەو کەشتییانەی کە بۆ دەریا پڕ شەپۆل و ئالۆزی باکوور دروستدەکران. مێژوو نووسێکی عوسمانی بەناوی "سلانیکی مستەفا"وێنایەکی ڕوون لە هاتنی کەشتییەکی بەریتانی دەخاتە ڕوو کە هەڵگری باڵوێزی بەریتانیا بۆ قوستەنتینییە بووە لە ساڵی ١٥٩٣دا:

"هەتا ئێستا کەشتییەکی بەم شێوەیە سەیر نەهاتبووە بەندەری قوستەنتینییە. ٣٧٠٠ مایلی بڕیبوو و ٨٣ تۆپی جگە لە چەکەکانی تر هەڵگرتبوو. تۆپەکانی بەشێوەی بەراز بوون. ئەم کەشتییە بەشتە سەیرەکانی سەردەم دەژمێردرێ، رۆژگار شتی وای بەخۆوە نەبینیوە"[٨].

موسڵمانەکانیش چەند کەنارێکیان لە زەریای ئەتڵەسدا لەژێر دەست دابوو، بەو شێوەیەی کە لە ئەوروپادا هەبوو و ئاسانکاری کرد بۆ گەشەی دەریاوانی ئەوروپییەکان و تەنانەت کردیشیە شتێکی پێویست، بەڵام هێندێك جار ئەو پرسیارە دێتە پێش کە بۆچی —بۆ وێنە- مەراکشییەکان هیچ کات نەپەڕینەوە ئەوبەری زەریای ئەتڵەس و ئەمریکایان نەدۆزییەوە؟ رەنگە هۆکارەکە ئەمەبێ کە موسڵمانەکان لە هێڵی کەنارەکانیاندا بەندەری ئەوتۆیان نەبووبێ کە ئاسانکاریی بۆ گەشەی دەریاوانیی ئەوروپییەکان کرد. هۆکارێکی دیکە رەنگە ئەوە بێ کە دەریای مەراکشییەکان تاڕادەیەکی زۆر لە بەردەستی خۆیان





دابوو، لەحاڵێکدا وڵاتە ئەورووپییەکان بە هۆی شەڕە بەردەوامەکانی نێوانیان، ڕۆژبەڕۆژ ئاستی لێهاتوویی دەریایی خۆیان بەرز دەکردەوە. هەربۆیە، لە ماوەیەکی درێژخایەندا ناکۆکیی وڵاتە ئەورووپییەکان بووە هۆی پێشکەوتنیان.

ئاڵۆزیی داهێنانە نوێیەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا تەنیا لە کاڵای شەڕدا کورت نابنەوە؛ بەڵکو بەرهەمهێنانە ئابوورییەکانیشی لەخۆ دەگرت. بۆنموونە، بۆ ماوەیەکی زۆر، ئاش کەرەستەی بەرهەمهێنانی وزە — جیا لەهێزی مرۆیی و ئاژەڵ- بوو. ئاش کەرەستەیەکی گەورە و جێگیرە و ناکرێ بشاردرێتەوە. لەبەر ئەوە دەبووە هۆی خۆشحاڵی کاربەدەستانی ماڵیاتی و ئێستاش دەبێتە هۆی خۆشحاڵی مێژوونووسان کە پشت دەبستن بە دەفتەرە ماڵیاتییەکان. چارڵز عیسەوی، هاوکارییەکەی من لە پرنیستۆن، بە بەراوردکردنی دەفتەرە نووسراوەکانی ئینگلیزییەکان و عوسمانییەکان نیشانیدا کە لە بەریتانیای سەردەمی نۆرمانەکاندا زۆرتر لە بەشە ناوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان سولەیماندا ئاش هەبووە[9].

داهێنانێکی زۆر گرینگی دیکە، چاپ بوو. دەزگای چاپیش وەك باڕووت هەر لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئەورووپا گوازرایەوە. بەدەر لە ئەزموونێکی کورت مەودا و کارەسات ئامێزی چاپی دراو بە دەستووری دەسەڵاتدارێکی مەغۆل لە ئێران[10] زۆری نەخایاند لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا. پەنابەرە جوولەکە ئیسپانییەکان، کە ساڵی **١٤٩٢**چوونە تورکیا، دەزگای چاپیان لەگەڵ خۆیاندا برد و سوڵتانی عوسمانی ئیزنی چاپی کتێبی پێدان؛ بەڵام بە مەرجێك کە کتێبەکان بە ئەلف و بێی عەرەبی نەنووسرێن. دواتریش ئەم ئیزنە بە کەمینە مەسیحییەکان درا. هەتا سەدەی هەژدەهەم لە سەرانسەری حوکمڕانیی عوسمانییەکاندا کتێب بە خەتتی عیبری، یۆنانی، ئەرمەنی، سریانی و هەندێك جاریش لاتین چاپدەکرا، بەڵام نەك بەوخەتە عەرەبییەی کە عوسمانییەکان و دانیشتووە موسڵمانەکانیی کەڵکیان لێوەردەگرت.[11] ئەم ڕەتکردنەوە توندەی پیشەسازیی چاپ لە دوو سەردەمی جیاوازدا، واتە ئەوکاتەی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هات و لە خۆرئاواوە ناسێنرا،



کاتێ سەرنج ڕاکێشتر دەبێ کە بزانین هەر ئەو تورکانە چەندین سەدە بەر لەوە، زۆر بە دڵەوە پێشوازییان لە کاغەز کردبوو.

پیشەسازیی چاپ و تۆپخانە بە گرینگترین لایەنەکانی جیاوازیی پێشکەوتنی نێوان ئەو دوو لایەنە دەژمێردرێن.گەشەو پەرە گرتنی بە پەلەی مەسیحییەکان لە ڕۆژئاوادا بەرانبەر بە وەرگرتنی هێواش، ناکاریگەر و نابەدڵانەی موسوڵمانەکان لەوڵاتە ئیسلامییەکاندا بە دڵنیاییەوە هۆکاری قووڵی کەلتووری و کۆمەڵایەتی لە پشتە، کە هەتا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆیان لەبارەوە نەکراوە. لە سەرەتادا باسی هۆکارێکمان کرد؛ بێهێزیی کۆمەڵگای سەربازی پشت بەستوو بە کۆیلایەتی لە بابەتی یەکسانبوون لەگەڵ گۆڕانکارییە نوێیەکان؛ واتە ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەکانی نێوەڕاست لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بەتەواوەتی باو بوو. ئەو کۆمەڵگا عەسکەرییە کۆیلەدارییە ئەوەی دەخواست کە ژنان لە پیاوان جیا بن و لە ژێر دەسەڵاتی پیاوان دابن. کەماڵ ئاتاتورك - دامەزرێنەری کۆماری تورکیا لە ساڵی**١٩٢٣** دا — ڕایگەیاند کە ئەگەر کۆمەڵگایەك بییەوی تەنیا بە ڕەگەزێك خۆی بە کاروانی شارستانیەت بگەیەنێ زیاتر لە پەنجا لە سەدیی لاواز دەبێ[12]. ژنانی ئەورووپا سەرەڕای بوونی جیاوازیی زۆر لەگەڵ بەدەستهێنانی یەکسانی لەگەڵ پیاواندا، بەهۆی نەبوونی یاسای فرەژنی و سیغە، ئازادی و بەشداریی کۆمەڵایەتیان زیاتر بوو، ئەمەش دەبووە هۆی سەرسوڕماوی پیاوانی موسڵمان[13]. شارستانیەتی ڕۆژئاوا بە هۆی ئامادە بوونی ژنان لەگۆڕەپاندا دەوڵەمەندترو شارستانیەتی ئیسلام بە هۆی بەشدارنەبوونی ژنان لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەژارتر بوو.

چەند ڕووداوی دیکە لە ساڵی **١٤٩٢**دا جیاوازییەکانی ئەو دوو جۆرە کۆمەڵگایە زیاتر دەخەنە ڕوو. لەو ساڵەدا "گۆڕۆنزۆ دوو مدیچی"، سەرداری کەم وێنەی سەردەمی ڕێنیسانس، کۆچی دوایی کرد. ناوبراو ڕۆڵێکی گرینگی لە پشتیوانیکردن لە زانست و کەلتووری نوێ و شێوازی نوێی بازرگانی گێڕا، هەروەها شێوازێکی نوێی بۆ سیاسەتی

دەرەوەی ئەوروپا دارشت کە کاریگەریی زۆری دانا لەسەر بەرفراوانیی هێزی ئەوروپییەکان لەجیهاندا.

هەر لەو ساڵەدا "ئانتۆنی دی نێبریخا"، مرۆڤگەرای ئیسپانی، کتێبی ڕێزمانیی کاستیلی بڵاوکردەوە. ئەم کتێبە بۆ یەکەم جار هەوڵدەدا کە زمانێکی خۆجێیی ئەوروپی جێگیر بکات و بیکاتە زمانی پێوەری ئەدەبی. هەتا ئەوکات بارودۆخی ئەوروپای لاتین و جیهانی عەرەب لەم بوارەدا تاڕادەیەك یەکسان بوو. هەر دوولا کەڵکیان لە زمانێکی سازکراو وەردەگرت. ئەوروپییەکان زمانی لاتینی سەدەکانی نێوەڕاست و عەرەبەکان زمانی عەرەبیی پۆست کلاسیکیان وەك زمانی ڕەسمی و ئەدەبی بۆ نووسین بەکاردەهێنا، بەڵام گفتوگۆیان بەزمانە خۆجێییەکان (ناوچەیی) دەکرد. "بێرنارد ڤێنسن"مێژوونوسی فەرەنسی وتوویەتی کە دیاریکردنی زاراوەی کاستیلی وەك زمانی ئیسپانی هاوکارییەکی زۆری بە دەرکەوتنی بووژانەوەی شارستانیەتی ئیسپانو ئەمریکی کرد[١٤]. ناوبراو بەم شێوەیە وتە گرینگەکانی زانایەکی ئاراگۆنی بەناوی "گۆنزالۆ کارسیا دی سانتاماریا" دەگێڕێتەوە: "چوونکە ئەمڕۆکە دەرباری ئێمە کاستیلیە, هەروەها چونکە پادشا و شاژنی شکۆمەندی ئێمە کاستیلیان وەك ناوەندی دەسەڵاتی خۆیان دیاری کردووە، بڕیارمداوە ئەو کتێبە بە زمانی کاستیلی بنووسم. چونکە زمان زیاتر لە هەر شتێکی دیکە پەیڕەوی لە دەسەڵات دەکا."[١٥]

زۆر توێژەری دیکەش لە سەر ئەم بڕوایەن کە کەڵك وەرنەگرتن لە زمانە خۆجێییەکان (ناوچەییەکان) و بەکارهێنانی بەردەوامی زمانی عەرەبیی کلاسیك لەنووسیندا بەربەستێك بووە لە بەردەم پێشکەوتنی کەلتووری عەرەبەکان.

ئیسلام لە سەدەکانی دە و یازدەی زایینیدا، بەدوای بووژانەوەی زانستە کۆنەکان و پێکهێنان و گەشەی زانستە نوێیەکان، بووژاوەتەوە. هەربۆیە بووژانەوەی ئەوروپا کاریگەری لە سەر عەرەبەکان نەبووە. "عەدنان ئادیوار" مێژوونوسی تورك، دەڵێ کە لە وڵاتە عەرەبییەکاندا ڕەوتی زانست لە بەرانبەر ئەدەبیات و فیقهدا تێکشکا[١٦]. جیهانی



ئیسلام لە سەدەکانی پازدە و شازدەدا هیچ جۆرە بووژانەوە و ڕیفۆرمێکی بەخۆوە نەبینیوە.

بەڵام بەوحاڵەش زۆر بەهێز مایەوە و ئەوروپای لەهەر دوو لای دەریای نێوەڕاستەوە خستە ژێر فشاری خۆیەوە. لە ساڵی ١٤٥٣دا، تورکەکان بە داگیرکردنی قوستەنتینییە زەربەیەکی قورسیان لە مەسیحییەتی ڕۆژهەڵات داو، شەڕێکی گەورەیان لە بەردەم ڕۆژئاوادا دانا. تورکەکان هەتا ساڵی ١٤٧٨ دەسەڵاتیان بەسەر یۆنان، ئەلبانیا، ڕۆمانیا و سلۆڤاکییەکانی باشووردا هەبوو و، هێزەکانیان هەتا دەوروبەری ڤێنیس چوونە پێش. ئەوان بەداگیرکردنی ئۆترانتۆ لە ساڵی ١٤٨٠دا پێگەیەکیان لە ئیتالیادا بەدەستهێنا. سەرکەوتنی ئیسپانیا لە غەرناتەدا سەرکەوتنێکی گەورە بوو کە ڕزگاریی ئەوروپای باشووری ڕۆژئاوای مسۆگەر کرد بەڵام نەك بەو ڕادەیەی کە کاریگەریی ئەوتۆی لە سەر ڕووبەڕووبونەوەی ئیسلام و مەسیحییەتدا هەبێ. مەترسیی ئیسلام لە باشووری ڕۆژئاوای ئەوروپادا مایەوە و تەنانەت زیادیشی کرد و هەتا دوو سەدە دوایی کە تورکەکان بۆ ئاخرین جار لە ڤییەنا پاشەکشەیان کرد، لە نێو نەچوو. لەو سەردەمەدا دەسەڵاتدارە کاتۆلیکەکانی ئیسپانیا، نەختێك دوای سەرکەوتن بە سەر موسەڵمانەکاندا، ڕوویان بە لای دوژمنەکەی دیکەی خۆیان واتە جوولەکەکاندا وەرگێڕایەوە. جوولەکان لە شەڕ و سیاسەتدا گرنیگیان نەبوو؛ بەڵام لە کەلتوور و بازرگانیدا زۆر بەکەڵك بوون. بەڵام لە حەوزەی ئاییندا گومانی ئەوە دەکرا کە تایبەتیترین و هەستیارترین گرفتەکان دەنێنەوە.





لە سێزدەی تەموزی ساڵی ١٦٠٢دا، یەکێك لە دانیشتووانی دڵسۆزی شاری ڤێنیس بە نووسینی سکالآنامەیەك لەدژی پێشنیاری دامەزراندنی "دامەزراوەی نیشتەجێکردنی تورکەکان" وەستایەوە. ناوبراو لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دروستکردنی شوێنی حەوانەوە بۆ بازرگانە تورکەکان — بە هۆی جۆراوجۆر- مەترسی هەیە و گرفت پێکدێنێ، چوونکە بوونی ژمارەیەکی زۆرتورك لە شوێنێکدا دەبێتە هۆی دروستکردنی مزگەوتێك بۆ پەرستنی محەمەد لەو شیوێنەدا. ئەم کارە ریسواییەکی زۆر گەورەترە لە بوونی جوولەکان و ئاڵمانییە پرۆتستانییەکان. بێ سەروبەریی تورکەکان لێك هەڵوەشانەوەی ڕەوشتی بە دواوەیە. لە هەمووی گرینگتر، دامەزراوەی نیشتەجێ ُکردنی تورکەکان خزمەت بە بەرەوپێشوەچوونی پلانە سیاسییەکانی تورکەکان دەکا، کە تەنیا لەلایان سوڵتانێکەوە بەڕێوە دەچن و هێزێکی گەورەی دەریاوانیان لە بەردەست دایە. ئەم بابەتە، واتە کێشەی بوونی تورکەکان، زیاتر لە جوولەکان هەڕەشە لە ڤێنیس دەکا، کە سۆلتانێکیان نییە و هەموو دونیا سەرکوتی کردوون (واتە جوولەکەکان).[١]

بە کافر زانینی موسوڵمانەکان شتێکی تازە نەبوو. تەنانەت لەسەدەکانی نێوەڕاستدا لە سەرانسەی ئەورووپا داستانێك ڕەواجی هەبوو حەزرەتی محەمەدی بە قەشەیەکی هەڵگەڕاوە دەناساند کە بە هۆی ناڕەحەتی لە دۆڕاندنی هەڵبژاردنی پاپاکاندا کۆچی کردووە بۆ عەرەبستان و ئایینێکی نوێیی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ مەسیحییەت بونیاتناوە [٢]. جیا لەو داستانە بێ بنەماو بێ بناخانە، کاتۆلیکەکان زۆر جار لە باسەکانی خۆیان لە دژی پرۆتستانەکاندا ئیسلام بەگۆڕانێکی خێرا بۆ بەرپەرچدانەوەی تەسلیس و مریەم پەرستی دادەنا، بەجۆرە ڕێککەوتنێکیان لەنێوان دەسەڵاتدارانی عوسمانی و ئەمیرانی پرۆتستان لەقەڵەمدەدا. بەڵام بەدوژمن دانانێ



موسڵمانەکانی و جوولەکەکان بە دژی مەسیحییەت، زۆر کۆنتر و باوتر و بە لانیکەمەوە بۆ سەردەمی یەکەمین شەڕە سەلیبییەکان دەگەڕایەوە. [٣]

لەسەدەکانی نێوەڕاستدا (سەدەکانی تاریکی ) جوولەکەکان لە ئەوروپای مەسیحیدا بەڕادەیەکی باش تەحەمول دەکران. بەڵام گرفتەکە لەو کاتەوە دەستپێکرد کە سەلیبییەکان ویستیان شەڕ لەگەڵ کافرەکان لە سەرزەمینی پیرۆزدا دەستپێبکەن و وایان بە باش زانی کە ئەم کارە لە ماڵی خۆیانەوە دەستپێبکەن. مێژوونووسێکی هاوچەرخی عیبری دەڵێ:

"کاتێك کە ساتێ تێپەڕبوون بە شارە جوولەکەنشینەکان گەیشت، بە یەکتریان دەگوت کە ئێمە بۆ گەیشتن بە پەرستگای کافرەکان ڕێگایەکی دوور و درێژمان لە بەر دەم دایە تاکو بتوانین تۆڵەی خۆمان لە کوڕانی ئیسماعیل بستێنینەوە. باب و باپیرانی ئەو جوولەکانەی کە لە نێو ئێمەدا دەژین بە بێ هیچ هۆیەك عیسایان لە خاچ داو کوشتیان. وەرن با بۆ یەکەمجار تۆڵەی خۆمان لەوانە بکەینەوە و ئەوانە لە لاپەڕەی ڕۆژگار بسڕینەوە تاکو هیچ کەس ئیتر ناوی ئیسراییل نەباتەوە. مەگەر ئەوەیکە ئەوان ئایینی ئێمە قبووڵبکەن."[٤]

لە کۆتاییەکانی سەدەی یازدەهەمدا ژمارەیەکی زۆر لە کۆمەڵگای جوولەکەکان لە ئەوروپای ناوەندی و ڕۆژئاوادا ناچار بە قبووڵکردنی ئایینی مەسیحی کران، چوونکە بە پێچەوانەی ئەمەوە، دەبوایە گیانیان لە دەست بدەن. ئەم هاندانەی بیروڕای گشتی لە لایان کەسانێك و بەرپرسانێکەوە دەکرا کە باوەڕدارانیان بۆ شەڕێکی دیکەی سەلیبی بانگهێشت دەکرد. کەسانی بە ناوبانگی وەك "یوحەنای کاپیسترانۆیی" واعز و موفەتیشی فڕانسیسی سەدەی پانزدە کە سەرکەوتنێکی زۆری لە ڕێگەی ئازار و ئەشکەنجەی جوولەکان بەدەستهێنا، لەوجۆرە کەسانە بوون. بەڵام ناوبراو لەڕاکێشانی خەڵك بۆ شەڕێکی دیکەی سەلیبی سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا. ناوبراو دواتر بە پلەی قەددیسی گەیشت و ئێستاش ناوەکەی ڕازێنەرەوەی نەخشەی کالیفۆرنیایە.





لە رۆژگارەکانی رۆشنگەریی ئایینیدا کە مەسیحییەت لە نێوخۆ و دەرەوەدا لەگەڵ سێ مەترسیی گەورەی لەت بوون، ئایینی نوێ و بێ ئیمانیدا بەرەورووو ببوو، تەحەمولی ئایینەکانی دیکەی نەمابوو، بەتایبەتی لەو وڵاتەنەی کە بە تازەیی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەت. جوولەکەکان و موسڵمانەکان بە توندی هەڕەشەیان لە ئایین و سەربەخۆیی ئەوان دەکرد. جوولەکەکان و موورەکان لە رۆژئاوای ئەورووپا و تورکەکان و جوولەکەکان لە رۆژهەڵاتی ئەورووپا لە باس و خەتابەکانیان و تەنانەت لە یاسا داڕێژییە ناوچەیی و پاشایەتی و پاپییەکاندا وەك دوژمنانی مەسیحییەت دەژمێردران. لە ساڵی ١٦٧٠دا قەشەیەکی هێزی دەریاوانی بەریتانیا لە کەنارەکانی دەریای نێوەڕاست لەکەشتی دابەزی و وێڕای نووسینی بیرەوەرییەکانی سەفەر و هۆنینەوەی شیعرە تەنزییەکانی خۆی، ئاوای نووسی:

"ئەی خوایە، پاشا چارڵز، دوك یورك، بنەماڵەی سەڵتەنەتی و من لە بەڵای تورکەکان و جوولەکەکان کە گۆشتی بەراز ناخۆن، بپارێزە."

جێگای سەرسووڕمان نییە کە لەم فەزایەدا هەندێك جار خەیڵی پڕ لە جۆش و خرۆش پیلانگەلێکی ئاشکرا دەکرد. جوولەکان زۆر جار وەك بەکرێگیراو و جاسووس یان لانیکەم لایەنگری موسڵمانەکان ئاشکرا دەبوون و زۆرجاریش موسڵمانەکان دەبوون بە بەکرێگیراوی جوولەکەکان. لە ساڵی ١٨٧٧هەتا ١٨٨٨ نەیارانی لیبراڵی لایەنگری دیزرییلی، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، لە دەوڵەتی تورکیادا پشتیان بەو بەڵگانە دەبەست. "ئوکانێر"، نوێنەری لیبراڵی پارڵمان، نووسی: لەبارەی تورکیاوە دەبێ بگوترێ کە چوونکە ئەوانە تورکن کەوابوو پەیوەندییان لە گەڵ جوولەکەکاندا هەیە هەربۆیە ناچارن پشتیوانیانی لێبکەن. "ڤیمەن" مێژووزانی بەناوبانگی زانکۆی ئۆکسفۆرد لەوە توندتر دەدوێ و دەڵێ کە لە سەرانسەری ئەورووپادا تورك وەك دۆستترین بەشیی راگەیاندن لە دەستی جوولەکە دان. بەشەهامەتەوە دەکرێ بگۆترێ کە جوولەکەکان دۆستی تورکەکانن. تەنانەت گلادستۆن(سەرۆکی حیزبی لیبراڵ)یش لە وتووێژ لەگەڵ"دوك ئۆرگایل" دا وتوویەتی کە بە گومانێکی زۆر و بەهێزەوە



جوولەکە لە ژێر دەستی "جلی دیزی"(*) لەگەڵ ئەوسیاسەتانەدا پێوەندییان هەیە. کاتێك لیبراڵە بەریتانییەکان سەردەمی ڤیکتۆریا بەم شێوەیە بیردەکەنەوە و دەدوێن، هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەوانیتر، لە سەردەم و شوێنە بێ تەحەمولترەکان، خراپتر بیر بکەنەوە و بڕیار بدەن.

لە ئەیلوولی ساڵی ١٤٩٢دا واتا دوای داگیرکردنی غەرناتە، پاشا کاتۆلیکەکانی ئیسپانیای یەکگرتوو خۆیان لە بەرانبەر دوو مەترسیدا دەبینییەوە.

لەپلەی یەکەمدا مەترسیی هێرشی دووبارەی موسڵمانەکان لەوبەر دەریای نێوەڕاستەوە بوو کە نزیك بە چل ساڵ بەرلەوە بە داگیرکردنی بێزەنتی ئیمپراتۆرییەکی ئیسلامیی بە هێزیان پێکەوە نابوو و هێزە پیادە و دەریاوانییەکانیان بۆلای رۆژئاوا بڵاو دەکردەوە. هەرچەند کیلۆمەتر لەولاتر واتە لە مەراکێش، هێزە بەهێزەکانی موسوڵمانەکان، هەروەك لە ساڵی١٥٧٨دا نیشانیاندا، شکستێکی گەورەیان لە شەڕی بەناوبانگی "سێ پاشا" دا بە سەر پورتوگالییەکاندا سەپاند. هەربۆیە دەبوایە رێ و شوێنی بەرگریی توند بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ گەڕانەوەی ئیحتمالیی موسوڵمانەکان رەچاو کرابا.

مەترسیی دیکەش مەزهەب بوو. لەم لایەنەوە ئیتر ئیسلام وەك دوژمنێکی ترسناك سەیر نەدەکرا. لەباسەکاندا حسێبێکی زۆر بۆ ئیسلام نەدەکرا، چوونکە بەهۆی ئەوەی کە ئیسلام دوابەدوای مەسیحییەت سەری هەڵدابوو دەکرا بە جۆرێك هەڵگەڕانەوە لەقەڵەمبدرێ. تەنانەت دەکرا لە مەسیحییەتدا وەك "کەری جرجاڵ" ناوی ببردرێ.

سەرنج راکێشیی ئیسلامیش کە لە سەردەمی پیشڕەوییەکانیدا بۆ لایەنگرە نوێیەکانی زۆر بەهێز بوو، بەڵام بە پاشەکشەی موسڵمانەکان ڕووی لە کزی کرد. تەنانەت سەرکەوتنە رەهاکانی عوسمانییەکانیش نەیانتوانی وەك سەرکەوتنەکانی

(*) کورتکراوەی ناوی دیزرێیلیی سەرۆك وەزیر بوو.





سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلام بە تێکشکاوەکان بقبوولێنیٚ کە ئیسلام ئایینی بەرحەقی خوایە. بەوحاڵە، جوولەکەکان شتێکی جیاواز بوون.

ئەوان لەبواری سیاسی و عەسکەرییەوە گرینگییەکی ئەوتۆیان نەبوو. هەروەك سکالاّ نووسە ڤنیزییەکە زۆرجوان ئاماژەی بەو راستییە کردبوو کە جوولەکەکان خەڵکانێکی بێ سەرکردە و سەرکوتکراو بوون، کە تەنانەت ئەگەر هەوڵیشیان دابا نەیاندەتوانی پڕمەترسی بن. بەڵام ئەو ئاستەنگە مەزهەبییە شاراوەییەی کە جوولەکەکان بە سەر مەسیحییەکاندا سەپاندبوویان، شتێکی دیکە بوو. کەسێك کە لە کۆنەوە خاوەنی ئایینێکی بەرحەق بووە ناکرێ بەناوی کافر و هەڵگەڕاوە لە گۆڕەپان دەربکرێ. مەسیحییەکان تەوڕاتیان قبووڵکرد و ناوی سەردەمی عەتیقیان لێنابوو و بەشێکی نۆییان پێوە زیاد کردبوو کە دەیانگوت عیسای مەسیح بۆ تەکمیل کردنی راسپاردەکانی خوا و بەڕێوەبردنی بەڵێنییەکانی خوا بۆ جوولەکەکان نێردراوە. بەم شێوەیە جوولەکەکان دەبوایە یەکەمینی ئەوکەسانە بن کە ئیمان بە ئایینی نۆی بێنن و شوناسی خۆیان بە تەدریجی وەك میراتگری نوێی هەڵبژێردراوی خواوەند لە کەنیسەی مەسیحیدا موستەحیل کردبا. ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان ئەم روانگەیان قبووڵکرد و لەدەوری مەسیح کۆبوونەوە. بەڵام لاساری هێندێك کەس و مانەوەی ئایینی جوولەکە، زۆر لە مەسیحییەکانی تووشی شك وگومان کردبوو لەڕێ و شوێنەکانی ئایینی خۆیان. جوولەکەکان بە پێچەوانەی موسوڵمانەکان نەدەکرا بە ناوشیاری لە سەردەمی عەتیق یان بە بێ ئاگایی لە دیاریکردن و بەڵێنیەکانی خوا تاوانبار بکرێن.

زۆر لەو جوولەکانەی کە مەسیحیەتیان بەزۆر قبووڵکردبوو ئەم ئایینەیان تووشی ئاستەنگ و تەنگژە دەکرد. بۆ وێنە، زۆر لەو جوولەکانە کە بە رواڵەت ئایینی مەسیحیەتیان قبووڵکردبوو و منداڵەکانیان بە پێی رێ و شوێنی ئەم ئایینە گۆشدەکرد و رێ و شوێنی ئایینی مەسیحییان فێری منداڵەکان دەکرد بەڵام لە ژێرەوە پابەند بە بیروباوەڕی خۆیان دەمانەوە، لەم رێگایەوە بۆ منداڵەکانیان دەگواستەوە.



مەسیحییەکان یەکێك لەو هۆکارانەی بۆ دەرکردنی جوولەکەکان باسیان لێوە دەکرد ئەوە بوو کە ئامادەبوونی بەردەوامی جوولەکە سەرکەشەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسانەی لە رووی ناچارییەوە مەسیحیەتیان قبووڵکردووە لەمەوبەدوا واز لە ئایینی مەسیحییەت بێنن و جۆرە هەڵگەڕانەوەیەك لە نێو کۆمەڵگە مەسیحییەکاندا سەرهەڵبدا.

مەترسییەکی دیکەو — لە درێژ ماوەدا — گەورەتر ئەوە بوو کە جوولەکەکان بۆ قەشە مەسیحییەکان پێکیان دەهێنا. "یوحەنای کاپیسترانوێیی" ئەو مەترسییەی بەباشی دەستنیشان کردبوو و لە وتارەکانی خۆی لە ئاڵمان و ڤییەنادا ئاماژەی بەوە کردبوو کە جوولەکان ئەو بیرە فریودەرانەیە لە نێو مەسیحییەکاندا بڵاودەکەنەوە کە هەر کەسێك تەنیا دەتوانێ لە ئایینی خۆیدا ببەخشرێ[٦]. ناوبراو شتێکی نارەوای وەپاڵ جوولەکان نەدەدا، چوونکە بەپێی رێنوێنییەکانی حاخامەکان، بەر لە دابەزینی دە فەرمان بۆ حەزرەتی موسا، حەوت فەرمان بۆ حەزرەتی نوح دابەزیون کە بەسەر هەمووکەسدا فەڕزن[٧]. دوو فەرمانی یەکەم کە بانگەشە بۆ یەکتایی خوا دەکەن و نەهی لە کوفر و بوتپەرستی دەکەن، دەکرێ بە فەرمانە ئایینییەکان ناو ببرێن. فەرمانەکانی دیکە کە نەهی لە کوشتن و دزی و دەستدرێژیی جینسی و رەوشتی بێ بە زەیانە لەگەڵ ئاژەڵەکان دەکا، دەکرێ بە رێ و شوێنە سروشتییەکان ناوببردرێن. بە پێی وتەی بەناوبانگی حاخامەکان، ئیشی باشی هەرکەسێك بەشێکی لە بەهەشت بەردەکەوێ.

دەسەڵاتدارە کاتۆلیکەکان دوای داگیرکردنی غەرناتە و یەکپارچەیی پاشایەتیی ئیسپانیا، بە یەکیەتیی سیاسی و عەسکەری گەیشتبوون؛ بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمان و جوولەکە لە وڵاتانی ژێردەسەڵاتیاندا دەژیان، نەیانتوانیبوو بە یەکیەتییەکی ئایینی بگەن. ئەوان سەرەتا لە جوولەکەکانەوە دەستیانپێکرد چونکە جوولەکەکان لە بواری کردەیی و تیۆرییەوە گەورەترین مەترسی بۆ سەر ئامۆژگارییەکانی مەسیحییەکان و لەهەمان کاتدا لاوازترین رکابەر بۆ سوپای





ئەوان بوون. دەرکردنی ئەوخەڵکە بێ سەرکردە و سەرکوتکراوە ئاسان و بێ مەترسی بوو و، بە سەرەتای ئەزموونێکی باش بۆ هێرشە قورستر و گرینگترەکەی تر واتە دەرکردنی موسڵمانەکان دەژمێردرا.

فەرمانی دەرکردنی جوولەکەکان لە٣١ی مارتی١٤٩٢لە غەرناتەدا بە ئیمزای "فرێدیناند ڤایزابیل" گەیشت و لە ٢٩ی تەممووزدا بەڕەسمی ڕاگەیەندرا. بە پێی ئەو فەرمانە، گشت جوولەکەکان دەبوایە هەتا ٣١ی تشرینی یەکەم یان ئایینی مەسیحییەت قبووڵبکەن یان ئەوەی کە سەرزەمینی مەسیحییەکان بەجێ بێڵن.

دیارە ئەمە یەکەم دەرکردنی جوولەکەکان نەبوو. ئەوان پێشتریش لە کۆتاییەکانی سەدەی سێزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی چواردەهەمدا بەپێی فەرمانەکانی پاشایەتی لە بەریتانیا، فەرەنسا و زۆر شۆێنی تردا دەرکرابوون. بۆ ئاخرین جاریش نەبوو کە دەردەکران. تەنها چەند ساڵی دوای ئەمە واتا لە ساڵی ١٤٩٦دا جوولەکەکانی پورتوگاڵ وێڕای سەد هەزار جوولەکەی ئیسپانیایی کە پەنایان بۆ پورتوگاڵ بردبوو، بە توندوتیژییەکی زیاترەوە دەرکران. ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکانی ئیسپانیا و پورتوگاڵ ڕێگاچارەیەکی دژوار و مەترسیداریان هەڵبژارد، واتا بە شێوەیەکی ڕواڵەتی و ڕەسمی ئایینی مەسیحییەتیان قبووڵکرد بەڵام بە نهێنی لە سەر ئایینی باب و باپیرانی خۆیان مانەوە. جوولەکە بە مەسیحی بووەکان بەڕەسمی بە "مەسیحییە تازەکان" و بەناڕەسمیش بە"مەسیحییە کۆنەکان" و لەلایان ئیسپانییەکان بە "ماڕانۆ" واتە "بەراز" ناو دەبردران، چوونکە ئەوان ئەمەیان بەباشی دەزانی کە ئەم جوولەکانە بە ڕواڵەت ئایینی مەسیحیان قبووڵکردووە، بەڵام لەناخدا کاروکردەوە و پەرستن وئەرکەکانی جوولەکە بەجێ دەگەیەنن. ماڕانیزم بە مانای پابەندیی شاراوە بە ئایینێك، وێڕای داننانی ڕواڵەتی بە ئایینێکی تر، تەنیا پەیوەندیی بە نیمچە دوڕگەی ئیبێرییەوە نییە و لەهەموو شوێنەکانی تردا دەبینرێ. بەڵام لە هیچ شوێنێکدا گرینگیی جوولەکە نهێنییەکانی ئیسپانیا و پورتوگاڵی بە دەستنەهێناوە[8].



لەو دوو ڕووداوەی کە لە ساڵی ١٤٩٢دا ڕوویاندا، یەکەمیان واتە داگیرکردنی غەرناتە، ئێستاش وەك سەرکەوتنی گەورەی نەتەوەی ئیسپانیا و کەنیسەی مەسیحی جێژنی بۆ دەگێڕێ؛ بەڵام دووهەمین ڕووداو واتا دەرکردنی جوولەکەکان هیچکات بەڕەسمی جێژن نەگێراوە و[9] تەنیا بە ڕێزەوە یادی لێکراوەتەوە. تەنیا لەیەك وڵاتدا، واتا لە تورکیا، پێنج سەدەمین ساڵوەگەڕی ئەم ڕووداوە جێژنی بۆگێڕا؛ ئەویش نەك بەهۆی دەرکردنی جوولەکەکان لە ئیسپانیا، بەڵکو بەهۆی هاتنیان بۆ تورکیا؛ تەنیا وڵاتێك کە ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە دەرکراوەکانی لە ئیسپانیا و پورتوگاڵ پەنادا. لەساڵی١٩٩٢دا نەوەکانی ئەوکەسانەی کە پێنجسەد ساڵ لەمەوبەر پەنایان بۆ ئەوێ هێنا بوو لەگەڵ نەوەکانی ئەو کەسانەی کە پەنایان پێ دابوون، یادی ئەم ڕووداوەیان لە ئەستەمبۆڵدا کرد بە جەژن.

ئەو جوولەکانەی کە لە ئیسپانیا و پورتوگاڵ ڕایان کردبوو ڕوویان لەوڵاتە جۆراوجۆرەکانی وەك فەرەنسا و هۆڵەندا و بەریتانیا و ئیتاڵیا کردبوو. سەیر لەوەدایە کە هێندێك لەو جوولەکانەی کە لە دەستی زوڵم و زۆریی کاتۆلیکەکانی ئیسپانیا و پورتوگاڵ ڕوویان لە ئیتاڵیا کردبوو، لەو وڵاتەدا دووبارە پەنایان بۆ کەنیسە بردبۆوە. لە ڤێنیسدا تەنانەت ئاماژەکردن بە ناوی ماڕانۆ، سەربەستی و گیانی مرۆڤەکانی دەخستە مەترسییەوە و ئەوانیان بە ڕۆژئاوایی ناو دەبرد و ئەو جوولەکانەی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن، بە ڕۆژ هەڵاتی ناودەبران. لە ساڵەکانی دواییدا ژمارەییێکی زۆر لەوانە بۆ ئەوبەری زەریای ئەتڵەس پەڕینەوە و لە ئەمریکا نیشتەجێ بوون. کەسانی زۆر ناسراو و بەناوبانگ لەنێو پەنابەرە ڕۆژئاواییەکان و نەوەکانیاندا سەریان هەڵدا. بەڵام گرینگترین تاقم ئەو کەسانە بوون کە ڕوویان لە وڵاتانی ئیسلامی و بە تایبەتی ئیمپراتۆریی عوسمانی، ئەوروپا، ئاسیا و دواتریش ئەفریقیا کردبوو[10].

جوولەکەکان بە هۆی جۆراوجۆر، وڵاتانی ئیسلامیان بە باشتر دەزانی. ژەمارەیەکی زۆر لەو جوولەکانەی کە لە ئیسپانیا و پورتوگاڵ مابوونەوە وئایینی مەسیحییان قبۆلکردبوو، لە چاوەڕوانی هەلێك دابوون کە کۆچبکەن و ڕوو لە ئایینی





باب و باپیرانیان بکەنەوە. لە هەموو وڵاتانی مەسیحیدا تاوانی ئەم کارە مەرگ بوو. لەوڵاتانی ئیسلامیشدا هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بە گوناهی گەورە دەژمێردرا و سزای هەبوو، بەڵام ئەگەر کەسێك لە ئایینی مەسیحییەوە بۆ ئایینی جوولەکە هەڵگەڕابایەوە، بۆ ئیسلامییەکان گرینگییەکی ئەوتۆی نەبوو. پێشەوایانی موسڵمان زۆربەیان لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە قبووڵکردنی بەزۆریی ئاینێیك هیچ بەهایەکی نییە هەربۆیە هەڵگەڕانەوە لەو ئایینە بە کوفر دانانرێ[11]. هەربۆیە ماڕانووە جوولەکەکان کە دەیانویست بگەڕێنەوە سەر ئایینی باب و باپیرانیان، وایان بەباش دەزانی کە ڕوو لە وڵاتانی ئیسلامی بکەن، بەتایبەتی دوای ئەو ڕووداوەی کە لە ساڵی ١٥٥٥-١٥٥٦دا ڕوویدا. لەوساڵەدا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکانی پورتوگاڵ کە سەربەستانە لە موڵکی پاپا لە ئانکۆنای ئیتاڵیادا دەژیان، بە بوون بە ماڕانۆ تاوانبار کران و بە هەڵگەڕاوە ناسێنران. هێندێك لە وانە لە ماوەی لێکۆڵینەوەدا دانیان بەوە دانا بوو و خۆیان لە جوولەکایەتی شۆردبۆوە و سزاکەیان لە سێدارەدانەوە دابەزی بۆ خزمەتی هەتاهەتایی وەك سەوڵ لێدەری کەشتی. ئەوانی تر کە ٢٤ پیاو و ژنێك بوون، لە سەر مانەوەی ئایینی خۆیان سوور بوون هەر بۆیە هەڵواسران و سووتێنران. تەنانەت نێوبژیوانی نوێنەری سوڵتانی عوسمانی نەیتوانی گیانی ئەوان ڕزگار بکا[12].

ژمارەی ئەو جوولەکانەی کە پەنایان بۆ ئیمپراتۆریی عوسمانی هێنابوو زۆر زیاتر لەو جوولەکانە بوون کە ڕوویان لە وڵاتانی تر کردبوو. هەروەها ژمارەی کۆچبەرانی جوولەکە زۆر زیاتر لە کۆچبەرەکانی دیکەی بۆ وێنە مەسیحییە بەناو هەڵگەڕاوەکان بوو کە لە سەرانسەری ئەورووپا ڕوویان لە تورکیا کردبوو. تەنانەت دەکرێ بڵێین کە جوولەکەکان - لە ئیسپانیا و پورتوگاڵەوە - زیاتر لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپایی پەنایان بۆ ئیمپراتۆریی عوسمانی بردبوو. دەوڵەتی عوسمانیش نەك تەنیا داڵدەی ئەوانی دەدا بەڵکو بەڵگەی ئەوتۆش لە بەر دەستدایە کە تەنانەت هانی ئەم



جوولەکانەشی دەدا. سیاسەتێکی لەم چەشنە لە سەدەی پازدە و شازدەدا پێویستی بە شەرح و ڕاڤەکردن هەیە.

لە ساڵی **١٥٢٣** دا واتا ئەو کاتەی کە هێشتا دەرکردنی جوولەکەکان لە ئیسپانیادا لە دڵ و مێشکی مرۆڤایەتیدا مابۆوە، مێژوونووسێکی جوولەکە بە ناوی "ئەلیاهوو کاپساڵی"ئاوا دەنووسێ:

"سوڵتان بازید، پاشای عوسمانی، کاتێك گوێی لێبوو کە پاشای ئیسپانیا زوڵم لە جوولەکەکان دەکا و ئەوانیش بەدوای پەنایەکدا دەگەڕێن، زۆر دڵگران بوو هەر بۆیە فەرمانێکی دەرکرد کە بە پێی ئەم فەرمانە هیچکام لە دەسەڵاتدارانی شارەکان بۆیان نییە جوولەکەکان وەرنەگرن یان ڕەپاڵیان بنێن. بە پێچەوانەوە، دەبوایە بە باوەشێکی ئاواڵەوە وەریانبگرن و شەو و ڕۆژ خزمەتیان بکەن وهیچکەس ئازاریان پێ نەگەیەنێ. دوابەدوای ئەو فەرمانە هەزاران کەس لەو جوولەکانەی کە لە ئیسپانیا دەرکران پەنایان بۆ تورکیا هێنا و "کۆمەڵەی جوولەکەکانی تورکیا" یان پێکهێنا و خەریکی جێبەجێکردنی کاروباری خێرخوازانە بوون و بۆ ئازادکردنی دیلەکان پارەیەکی یەکجار زۆریان خەرجکرد"[13].

کاسپاڵی نە ئیسپانی بوو و نە تورك، ناوبراو ئەندامی کۆمەڵەی کۆنی جولەکەکانی دوڕگەی کرێت بوو، خاوەنی زمان و کەلتووری یۆنانی و هاووڵاتیی ڤێنیسی بوو. ناوبراو بانگەشەی بۆ ئەوە نەدەکرد کە مێژوونووسە؛ بەپێچەوانەوە، کاسپاڵی لە زۆر لایەنەوە پیاوێکی سادە و ناوشیار دەهاتە بەرچاو. مێژوونووسان زیاتر زانیارییەکانی خۆیان لە مێژوونووسەکانی تر وەردەگرن. بەڵام کاسپاڵی واینەدەکرد. ناوبراو هەروەك لە کتێبەکەیدا باسیدەکا، سەفەری ئەملاوئەولای دەکرد و پرسیاری لە خەڵك دەکرد کە چی ڕوویداوە. ناوبراو خۆی دەیگوت کە ژمارەیەکی زۆر لە بازرگان و دەریاوان لە سەرانسەری جیهانەوە ڕوو لەدوڕگەی ئێمە دەکەن؛ بۆ ئێمە تەنیا ئەوەندە بەسە کە لەگەڵیان بدوێین تاکو تێبگەین کە لە دنیادا چی ڕوویداوە[14]. ئەم تایبەتمەندییە بۆتە هۆی ئەوەی کە مێژووی کاسپاڵی چێژێکی

تایبەتی هەبێ. ڕاپۆرتەکانی ناوبراو، بەپێچەوانەی هەواڵی مێژوونووسانی تر، ڕاپۆرتی ڕەسمی لە سەر ڕووداوەکان نین، بەڵکو هەڵێنجراوی ئەو پڕوپاگەندانەن کە لە بەندەرەکانی دەریای نێوەڕاستدا بوونیان هەبووە. کەوابوو مێژووی کاسپاڵی ڕەنگدانەوەی ئەو شتانە نییە کە ڕوویانداوە؛ بەڵکو مێژووی کاسپاڵی ڕەنگدانەوەی زەین و هەستی کەسانی بەشدارە لەو ڕووداوانەدا. بەم هۆیەوە، کارەکەی ناوبراو بەهایەکی کەمتری لە کاری مێژوونووسانی تر نییە. ناوبراو زۆر بەباشی توانیویەتی قووڵایی تراژیدیای ئەو زوڵم و زۆرییەی کە لە سنووری فەرمانڕەوایی مەسیحییەتدا لە جوولەکەکان دەکرا، دەربڕێ. جوولەکەکان بەردەوام لە بەردەم مەترسیی دەسەڵاتی ڕوو لەگەشەی مەسیحییەکان دابوون، لەئاکامدا توانیان ئەو پەناگایەی کە بەدوایدا وێڵ بوون، بدۆزنەوە.

کاسپاڵی پێیوایە ئەو پێشوازییەی کە تورکەکان لە جوولەکەکانیان کرد زیاتر لە هەستی بەزەیییەوە سەرچاوەی دەگرت؛ سوڵتان دڵی بەحاڵی ئەوان سووتا. دیدی کاسپاڵی تا ڕادەیەك وەك ئەفسانە دەچێ و هیچ بەڵگەیەك لە بەردەست نییە کە دەربڕی ئەوە بێ کە سوڵتان بازید هۆگرییەکی تایبەتی یان هەستی بەزەیی بەرانبەر ئەو جوولەکانە هەبووبێ. بەڵام زۆر نووسەری لێهاتووی دیکەی جوولەکە داکۆکیان لەم ڕایەی کاسپاڵی کردووە.

دڵسۆزی هەستێکی بەرزە کە دەتوانێ دەربڕی کردەوەیەکی تاکەکەسی لە بارودۆخێکی تایبەتی دابێ بەڵام ناتوانێ پاساوی سیاسەتی ئیستراتژی وڵاتێك بێ لە قۆناغێکی دوور و درێژ و لە ژێر دەسەڵاتی چەندین دەسەڵاتداردا. مێژوونووسان بەناچار بەدوای هۆکارگەلێکی دیکەدا دەگەڕێن.

ڕەنگە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی نەتوانرێ سیاسەتێك بە پێی دڵسۆزی بدۆزرێتەوە. وەڵامدانەوە بەم پرسیارە کە بۆچی تورکەکان پشتیوانیان لە جوولەکەکان دەکرد، تەنیا لەسەرچاوە و بەڵگەکانی تورکەکاندا دەکرێ ببینرێ نەك لە سەرچاوەی جوولەکەکاندا. چەند ساڵ لەمەوبەر لەدرێژەی سەفەرەکەم بۆ بودابێست لە کتێبی



ڕێبەریی گەشتیاراندا خوێندمەوە کە وێرانەی کەنیسەیەك و چەند کەتیبەیەکی عیبری لە گەڕەکێك لە نزیك هۆتێلەکەدا هەن. بە پەلە خۆم بەو شوێنە گەیاند، دوای دیتنی کەتیبە عیبرییەکان لەقەڵای بوودا(*) دا لەوەی کە ئەو کەتیبانە بە خەت و شێوازی جوولەکەکانی سێفاڕادیی تورکیا بوون، زۆر سەرسام بووم“ لەحاڵێکدا کە دەبوایە بەشێوازی جوولەکەکانی ئەشکنازیی ئەورووپای ناوەندی بوونایە. پرسیار ئەوە بوو کە جوولەکەکانی سێفاڕادیی عوسمانی لە سەدەی هەڤدەهەمدا لە بوودا چییان دەکرد؟

مێژووی ئەورووپای ناوەندی لەو سەردەمەدا لەلایەك و بەڵگە و کۆکراوەکانی تورکیا لە لایەکی دیکەوە بەگشتی دەتوانن ئەو شتانەمان بۆ بخەنە ڕوو. کاتێك کە تورکەکان لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا بەشێکیان لە هەنگاریا داگیرکرد و بەڕێوەبەریی ئەو وڵاتەیان کەوتە دەست، جوولەکەکانی خۆیان ناردە هەنگاریا و داواشیان لە جوولەکەکانی خۆیان کرد کە ڕوو لە تورکیا بکەن. پاشان کاتێك کە لەساڵی ١٦٨٦دا ئەو شوێنەیان بەجێهێشت، جوولەکەکانیان لەگەڵ خۆیان بردەوە و فەرمانی توندیان بۆپاراستن، کۆچپێکردن و نیشتەجێکردنی دووبارەیان لە شوێنە گونجاوەکان لە سنووری ئیمپراتۆریی عوسمانی دا دەرکرد.

بەڵگەکان لە سەرچاوەکانی تورکەکاندا، کە ڕاستیی ئەو سەرچاوانە لە سەرچاوەی تریشدا سەلمێنراوە، پێگەی ئەو جوولەکانە نیشاندەدا. ئیزن بدەن ئەو بابەتە بە ئەزموونێکی تاکەکەسیی خۆم شیبکەمەوە.

بەر لە چل ساڵ لەمەوپێش کاتێك کە بۆ یەکەمجار کۆکراوەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانیم دەپشکنی، لەو حەینەدا چاوم بە بەڵگەیەك کەوت کە بەرواری هەشتی تشرینی یەکەمی١٥٧٦ی لەسەر بوو کە بۆ حوکمڕان "صفد" لە فەلەستین نێردرابوو. لەو بەڵگەیەدا سوڵتان فەرمانی دابوو کە دەبێ هەزار جوولەکەی شاری "صفد" و دەوروبەری ناونووس بکرێن و بۆ شاری "فاماگوستا" لە قوبرس بنێردرێن. دوابەدوای ئەو فەرمانە، حوکمڕانی ناوبراو هەزارکەسی لە جوولەکە دەوڵەمەند و

(*) Buda بەشێکە لە شاری بودابێست و هیچ پێوەندییەکی بە ئایینی Buddha وە نییە.

داهاتوودارەکانی وێڕای بنەماڵە و سامانەکەیان - بە چاوەدێرییەکی تایبەتییەوە - ڕەوانەی ئەو شارە کرد.

فەرمانێکی تر بە بەرواری ٢٧ی ئەیلوولی ١٥٧٧ کە بۆ دادوەرەکانی "مەنسوورە" و "قنیطرة" - دوو شاری نێوان "صفد" و دیمەشق - نێردرابوو، دەبوایە ٥٠٠ بنەماڵەی جوولەکەی دەوڵەمەند کۆچیان پێبکرێت بۆ قوبرس، کە ئەم بڕیارە بۆ ئاوەدانی و بووژاندنەوەی ئەو دورگەیە دراوە. پێویستە کە هەرجارە و کەشتییەکی نوێ بۆ گواستنەوەی ئەوان بنێردرێ و شارێکی گونجاو و باش بۆ نیشتەجێبوونیان تەرخانبکرێ. لەو بوارە تایبەتییەدا، ئەو جوولەکانەی کە حەزیان لە جێهێشتنی فەلەستین نەبوو توانیان کاربەدەستانی عوسمانی ناچار بە گۆڕینی بڕیارەکە بکەن. فەرمانێکی دیکە کە لە بەرواری ٢٣ی ئابی ساڵی ١٥٨٧دا بۆ دادوەری "صفد" دەرچووە، هۆکاری ئەم کارەی بۆ شەرح دەکا. باجی ساڵانەی جوولەکەکانی صفد نزیك بە ١٥٠٠لیرەی زێڕ(ئاڵتوون) بوو کە ڕاستەخۆ دەخرایە خەزێنەی سەڵتەنەتی. ئەوان هەروەها ساڵانە ٤٠٠ سکەی زێڕیان لە بری ئیجارەی کاروانسەرایەك دەدا کە سەر بە (قبة السخرة) ی مزگەوتی حەبرون بوو. هەروەها بەڕێوەبەریی گومرگی شاریش ساڵانە دە هەزار لیرەی زێڕی لە جوولەکەکان وەردەگرت. لە ئاکامی کۆچی ئەو جوولەکانە بۆ قوبرس، داهاتی شار بە توندی ڕووی لە کزی دەکرد و "صفد" بەرەو وێرانی دەچوو، هەروەها زەربەیەکی قورسیش بە خەزێنەی دیمەشق دەکەوت. خانووبەرەکانی جوولەکەکان بە چۆڵی دەمایەوە چونکە کریارێکی نەبوو، ئەو سامانەی کە نەدەگوێزرایەوە ئەوا لەنێو دەچوو و زەرەر و زیانێکی دیکەیان پێدەکەوت. هەربۆیە فەرمانی ڕاگواستنی جوولەکان بەڕێوە نەچوو و داوایان لێکرا کە لە ماڵ وحاڵی خۆیاندا بمێننەوە و درێژە بە کار و پیشەیان بدەن.

فەرمانێکی تر لە ساڵی دواییدا کە بۆ حوکمڕانی قوبرس نێردراوە، دەربڕی ئەوەیە کە ناوبراو هەروا خوازیاری ناردنی جوولەکەکان بووە. ناوبراو ڕاپۆرتی ئەوەی دابوو کە ئیزنی چوونەدەرێ بە تاقمێك لەو جوولەکانە نەداوە، کە لە ڕێڕەوی خۆیان لە



سالۆنیکییەوە بۆ "صفد" لە قوبرس پشوویان دابوو، داواشی لێکردون کە لە قوبرس بمێننەوە[١٥].

ئەو فەرمانانە دوای ئەوەی کە ئیمپراتۆریی عوسمانی قوبرسی لە ساڵی ١٥٧١دا لە دەستی دەوڵەتی ڤنیس دەرهێنا، دەرچوونە، وێکچوونێك لە نێو هەموویاندا بەدی دەکرێ. ئەو بەڵگانە لە هەمان کاتدا فەرمانە وێکچووەکانی دیکەش لە خۆ دەگرن کە لەو سەردەمەدا لەلایان سوڵتانەوە بۆ حوکمرانە جۆربەجۆرەکان لە ناوچەی ئاناتۆلی نێردراون کە بۆ وێنە لەو فەرمانانەدا داوای ڕەوانەکردنی وەرزێران و ئاژەڵداران بۆ قوبرس دەکەن. ئەوانە هەمووی بەشێك بوون لە سیاسەتی گشتی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ڕاکێشانی دانیشتووی نوێ لە ناوچە داگیرکراوەکان، کە لە سەرەتادا بۆ ئەم کارە بانگهێشت دەکران و لە قۆناغی دووهەمدا ئەگەر قبووڵیان نەکردبا، بە زۆرەملێ ڕەوانەی ئەو شوێنە دەکران. کاروکردەوەی جوولەکەکانی ئیسپانیا لە بوودا دا وەك کردەوەی جوولەکەکانی "صفد" لە قوبرس و جوولەکەکانی دیکە بوو کە ڕەوانەی سەرزەمینە تازە داگیرکراوەکان کرابوون هەتاکو تۆخمێکی لەبواری ئابوورییەوە چالاك و لەبواری سیاسییەوە جێی متمانە بۆ دەوڵەتی عوسمانی پێکبێنن. جوولەکەکان بە پێچەوانەی مەسیحییەکان کە زۆرینەی کۆمەڵگایان پێکدەهێنا، داخ و کەسەرێکی ئەوتۆیان بۆ لەدەستچوونی شکۆمەندیی شارستانیەتی بێزنتی نەدەخوارد و زەوقێکی هەستپێکراویان بۆ ڕزگاربوون لە ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیان لە خۆیان نەدەنواند. زۆربەی ئەو جوولەکانە پەنابەرانی وڵاتانی مەسیحی بوون. لەڕاستیدا لەنێو ئەو هەموو نەتەوە و تاقمە ئایینییە جیاوازانەی کە لە ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون، جوولەکەکان تەنیا نەتەوەیەك بوون کە بە شێوەیەکی خۆویستانە لەو وڵاتەدا دەمانەوە.

کۆچی جوولەکە ئەورووپییەکان بۆ تورکیا لە ساڵی ١٤٩٢دا دەستی پێنەکردبوو، هەروەها ئەوان تەنیا لە ئیسپانیاوە کۆچیان نەکردبوو. ژمارەیەکی زۆریان بەهۆگەلێکی باش و روون لە سەرزەمینە ئیتاڵییەکانی ژێردەسەڵاتی ئیسپانیا و

بەشەکانی تری ئیتاڵیا و ئەورووپای ناوەندی ڕایان کردوو و روویان لە تورکیا کرد. بەڵام زۆربەی جوولەکەکان، بەپێی بەڵگەنامە ماڵییەکانی عوسمانی لە سەدەی شازدەهەمدا، لە شار و پارێزگاکانی ئیسپانیاوە هاتوون. زمانی ئیسپانیایی ئەو جوولەکانە تاکو ئیستاش پارێزراوە و بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر، تەنانەت گوازراوەتەوە بۆ جوولەکە، یۆنانی زمانەکانیش کە لە قۆناغی شارستانیەتی بێزەنتییەوە لەوێ نیشتەجێن.

هەروەك چۆن کوشتاری بە کۆمەڵی جوولەکەکان لە ناوچەی (ڕاین)دا وەك ڕاهاتنێك بۆ شەڕەکانی سەلیبی وابوو، دەرکردنی جوولەکەکانی ئیسپانیاش ڕێگای دەرکردنی موسڵمانەکانی خۆشکرد.

لە ماوەی چەند سەدە شەڕ بۆ ئەستاندنەوەی ئیسپانیا لە موسڵمانەکان، کاتێك کە ئیسپانیا بە دوو بەشی ئیسلامی و مەسیحی دابەشببوو، پێشەوایانی مەسیحی زیاتر لە موسڵمانان پێیان خۆش بوو کە جوولەکە و موسڵمانەکان لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بژین، بەڵام بەو مەرجانەی کە لە وڵاتانی ئیسلامیدا بە "ذمة" [١٦] ناو نرابوون، چونکە بە پێی ئەم یاسایە، کەمینە ئایینییەکان لە بەرانبەر بەڕێوەبردنی سەربەستانەی ڕێ و شوێنە ئایینییەکانیان، دەبوایە سەرانە و مالیاتێکیش بە دەوڵەت ببەخشن. دیارە بابەتی زۆر دەگمەن لە ڕاکردنی جوولەکان لە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانەکان لە ئیسپانیای سەدەکانی نێوەڕاست و پەنابردنیشیان بۆ مەسیحییەکان بەرچاو دەکەوێ.

داگیرکردنی ئیسپانیا لە لایان مەسیحییەکانەوە بۆ جوولەکەکان لە پلەی یەکەمدا بە مانای گۆڕانی دەسەڵات بوو. ئەم گۆڕانە بۆ موسڵمانەکان دژوارتر بوو، چونکە دەسەڵاتدار شوێنی خۆی بە ژێردەستە دابوو. بەو حاڵەش ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان ئامادە بوون ئەم گۆڕانە قبوولبکەن و لە ئیسپانیا و لە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکاندا درێژە بە ژیان بدەن. ئیسپانییەکان بەو کەسانەیان دەگوت "



مۆدێجەر"[١٧]، کە لە "مُدجن" ی عەرەبی وەرگیرابوو و لە ڕاستیدا بە مانای "ئاژەڵی خۆماڵی" کە کەڵکی لێوەردەگیرا لە بەرانبەر "ئاژەڵی وەحشی" دا.

بەڵام مانەوەی موسڵمانەکان لە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکان دا تەنیا بە مانای بەرگەگرتنی ئەم ناوە سووك و چرووکانە نەبوو. لە نێو زانایانی موسڵمانان دا ئەو مەسەلەیە هاتبووە ئاراوە کە لە بواری شەرعییەوە ژیانی موسڵمانان لە وڵاتێکی ناموسڵماناندا دروستنییە و کەم و کورتی تێدایە و وەك چۆن پێغەمبەرەکەیان ژیانی لە سێبەری دەسەڵاتدارە کافرەکان قبووڵنەکرد و لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوانیش دەبوایە کۆچ بکەن بۆ وڵاتێکی موسڵمان. زۆربەی زانا مالیکییەکان _ سەر بە مەزهەبی سوننەن _ کە لایەنگرێکی زۆریان لە باکووری ئەفریقیادا هەبوو، لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە دەبێ موسڵمانەکان لە ئیسپانیاوە بەرەو وڵاتێکی موسڵمان کۆچبکەن و لەوێ نیشتەجێ بن. "ابن رشد"[١٨]، دادوەر و پێش نوێژی مزگەوتی "قرطبة" و باپیری "ابن رشد" ی فەیلەسووف، پێی وابوو کە فەتوای کۆچ لە وڵاتانی کافرەکانەوە بۆ هەموو سەردەمێك ڕاستە و نابێ موسڵمانان لە وڵاتێکی ژێر دەسەڵاتی کافرەکاندا بژین" دەبێ بێ وەستان و دوودڵی کۆچ بۆ وڵاتێکی ئیسلامی بکەن، وەك چۆن یارانی پێغەمبەری ئیسلام دوای گرتنی مەککە ئیزنیان پێدرا کە بگەڕێنەوە زێدی خۆیان، ئەوانیش دەتوانن دوای گەڕانەوەی ئەم وڵاتانە بۆ باوەشی ئیسلام، بۆ زێد و شوێنەکانیان بگەڕێنەوە.

چەند ساڵ دواتر، پێشەوایەکی مەڕاکیشی بە ناوی "ئەحمەد ئەلوانێتریشی" پێی لەوەش زیاتر هەڵبڕی و، ڕایگەیاند کە تەنانەت ئەگەر مەسیحییەکان بە ویژدان و دادپەروەریشەوە هەڵسوکەوت بکەن ئەوا دیسان بۆ موسڵمانان ڕێگەپێدراو نییە کە لەو شوێنانەدا درێژە بە ژیان بدەن، چونکە تەنیا لە وڵاتێکی ئیسلامیدا دەکرێ ڕێ و شوێنە ئایینییەکانیان بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچن. هەروەها، مەترسی بە مەسیحی بوونی موسڵمانان لە دەسەڵاتێکی دادپەروەریی مەسیحیدا زیاترە.[١٩]





دادپەوەری و ئینسافی مەسیحییەکان بە دەستبەسەرداگرتنی هەموو ئیسپانیا، کۆتایی پێهات. ئەم گۆڕانە کاتێك زیاتر بەرچاو دەکەوت کە داگیرکردنی بە تەواوەتیی غەرناتە لە ڕێگای شەڕەوە مەیسەر نەبوو، بەڵکو موسڵمانەکان لە ڕێگای دانووسانی قایمەقام و سەرمایەدارانی شارەوە، خۆیان بە دەستەوە دا. لەو گرێبەستەدا هاتبوو کە دەبێ ئاسایشی ئەریستۆکراتەکان بپارێزرێ و پاشای مەسیحییەکانی راسپاردبوو کە دەبێ پارێزگاری لە هەموو سەرمایەی موسڵمانەکان بکاو، ئیزنیان بدا و هەلی ئەوەیان بۆ بڕەخسێنێ کە سەربەستانە ڕێ و شوێنە ئایینییەکانیان بەڕێوەببەن، ئەوان لە بەخشینی هەر جۆرە باج و ماڵیاتێك - جگە لەو شتانەی کە لە ئایینی خۆیان دایە وەك زەکات و...هتد - هەڵاوێرن و موسڵمانان ئەو مافەیان هەبێ کە لە دادگا ئیسلامییەکاندا لێپرسینەوەیان لە گەڵدا بکرێ. هەروەها هاتبوو کە: "گشت مووروەکان، بە گەورە و بچووك و ژن و پیاوەوە لە هەر شوێنێك کە پێیان خۆش بێ، بژین و بتوانن سەروەت و سامانەکەیان - بە گوازراوە و نەگوازراوە _ بە هەر کەسێك و بە هەر شێوەیەك کە پێیان خۆش بێ، بفرۆشن، بە بێ ئەوەی کە ئەو سامان و سەروەتە دەستی بە سەردا بگیرێ چ لە کڕیار و چ لە فرۆشیار."

یاسای دیکەی لەم جۆرەش هەبوون کە مافی مووروەکانی لە کاتی کۆچ و بردنی کەرەستەکانیان - جگە لە چەك - دەپاراست.[20] موسڵمانەکان لەو قۆناغەدا دەرنەکران، بەڵام ئەو هەل و مەرجە هەڵسەنگێندراو و دڵخوازانەیەی کە بۆ کۆچی خۆویستانەی ئەوان لە گرێبەستی خۆبەدەستەوەدانی غەرناتە و بەڵگەکانی دیکەدا هاتووە، بە ڕوونی ویستی سەرکەوتووانی شەڕ بۆ کۆچی موسڵمانان دەردەخا هەر بۆیە زۆری پێنەچوو کە ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانانی سەر بە چینی ئەریستۆکرات ڕوویان لە باکووری ئەفریقیا کرد.

لە ساڵی ١٤٩٨ دا بە هاتنی "فڕانسیسکۆ خیمنس سیسفرۆس" پاپای گەورە و بەناوبانگی تۆلدۆ (طلي طلة)، سیاسەتەکە گۆڕانی بە سەر داهات و گوشاریان خستە سەر موسڵمانەکان کە یان دەبێ ببن بە مەسیحی، یان دەبێ غەرناتە بەجێ بێڵن. ئەو



گوشارە کۆمەڵایەتییانە موسڵمانە جێماوەکانی لە ١٤ ی کانوونی یەکەمی ١٤٩٩ دا ناچار بە شۆڕش و ڕاپەڕین کرد، کە لە ئاکامدا لە ساڵی ١٥٠١ دا بە پشتیوانی سوپا سەرکوت کراو، موسڵمانەکان ناچار بوون مەرجەکانی مەسیحییەکان قبووڵبکەن. ئەم مەرجانە هەمان ئەو مەرجانە بوون کە دە ساڵ پێش بە جوولەکەکان پێشنیار کرابوو: یان هەڵگەڕانەوە، یان تاراوگە، یان سێدارە.

ئەو فەرمانە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٥٠٢ دا بە موسڵمانەکانی کاستیل (قشتیلە) کە موسڵمانەکانی غەرناتەشی لە خۆ دەگرت، ڕاگەیەندرا، پاشان لە بارەی موسڵمانەکانی ناوا، ئاراگۆن، ڤالێنسیا و بەشەکانی تری ئیسپانیادا بەڕێوە چوو. ئەوانەی کە ڕۆیشتن، زۆربەی دارایی و سەروەتەکەیان جێهێشت و" ئەوانەی کە مانەوە ئەگەرچی ببوون بە مەسیحی، بەڵام هەمیشە گومانیان لە سەر بوو، چوونکە پێیان وابوو کە ئەوان کاروباری ئایینی خۆیان بە نهێنی بەڕێوە دەبەن و پێوەندییان لەگەڵ موسوڵمانەکاندا هەیە. ئەوان بە مۆڕیسکۆ[21] ناو دەبران کە هاوتای چەمکی ماڕانۆ بوو کە بە جوولەکەکان دەگوترا. موسڵمانەکان و جوولەکەکان کە بە ناو و ڕواڵەت مەسیحی بوون، بەردەوام لە ژێر چاودێری دادگای ئەنگیزاسیۆن (پشکنینی بیر و باوەڕەکان) دابوون.

بە درێژایی سەدەی شازدەهەم کێشەی نێوان موسوڵمانە بەمەسیحی بووەکان و دەربار و کەنیسە درێژەی هەبوو. مۆڕیسکۆکان بەردەوام لە گەڵ گومان و هەڵاواردنی مافی و ماڵیاتیدا بەرەوڕووبوون و لەگەڵ موسڵمانەکاندا بە شێوەیەك هەڵس وکەوت دەکرا کە دەتگوت بە هیچ شێوەیەك نەبوونەتە مەسیحی، ئەگەرچی ژمارەی دانیشتوانەکانیان لە کۆچە خۆویستانەکاندا ڕوو لە کەمبوونەوە بوو، بەڵام هەروا بەشێکی گەورەیان لە حەشیمەتی ئەو وڵاتە پێکدەهێنا و نارەزایەتییەکانیان هێندێك جار دەبوون بە شۆڕشێکی ئاشکرا. لە ساڵی ١٦٠٨_١٦٠٩ لە کۆبوونەوەی قەشەکانی ئیسپانیادا داواکاریی پرۆتیستۆکردنی بە کۆمەڵی مۆڕیسکۆکان وەك هەڵگەڕاوە پەسەند

نەكرا بەڵام لە بەرانبەردا پێشنیار بۆ ئەوە كرا كە بە گشتی تێبكۆشن تاكو موسڵمانەكان لە ناخی دڵەوە بكەن بە مەسیحی.

بەو حاڵەشەوە، لە ساڵی ١٦٠٩ لەڕواڵەتدا بە هۆی یەكگرتن لە گەڵ هێزە دەرەكییەكان، بڕیاری وەرگرتنی موسڵمانەكان درا و بەڕێوەبردنی ئەو بڕیارەش تاكو ساڵی ١٦١٤ بەردەوام بوو. زۆربەی مۆریسكۆكان كە لەو سەردەمدا ٣٢٠٠٠٠كەس و ٣ لە سەدی حەشیمەتی وڵات بوون، ڕوویان لە ئەفریقیای باكوور كرد و هێندێكیش كۆچیان بۆ ئیمپڕاتۆریی عوسمانی كرد.

بەڵام دەركردنی جوولەكەكان و موسڵمانەكان و سەركوتی مارانۆكان و مۆریسكۆكان لە دڵەڕاوكێی ئیسپانییەكانی كەمنەكردەوە، چونكە مەترسییەكی گەورەیان لە لایان ئەوانەوە هەستپێدەكرد. هەربۆیە سیستەمێكی ئاڵۆزی بەڕێوەبەری و یاسایی و سیخوڕی پێكهات بۆ ئاشكراكردن و پێشگیری لە كارتێكەریی جوولەكەكان و موسوڵمانەكان، دۆزینەوە و سووتاندنی هەر ڕیشەیەك لە خوێنی جوولەكە و موسوڵمانەكان و پاراستنی دەوڵەت و كەنیسە و خەڵكی ئیسپانیا لە پیس بوون بەو خوێنە.[٢٢]

دڵەڕاوكێیەكان چەندین سەدە درێژەیان هەبوو و هەندێك جاریش بە هەستكردن بە مەترسییەكی نوێی دەرەكی، ئەم دڵەڕاوكێیە زیادیدەكرد. بەریتانیا كە هیچ سەرنجێكی بە كێشە نەتەوەیی و ئایینیەكان نەدەدا، لە ساڵی ١٧٠٤ دا "جبل الطارق" ی داگیركرد. چوونی ژمارەیەكی كەم لە جوولەكە و موورەكان بۆ "جبل الطارق" دڵەڕاوكێیەكی نوێی لە ئیسپانیادا دروستكرد. بەپێی ماددەی ١٠ی ڕێككەوتننامەی ئووتریخت، دەوڵەتی ئیسپانیا لە ساڵی١٧١٣ دا دەسەڵاتداریی "جبل الطارق" ی بە بەریتانیا بەخشی. بەڵام سەرەڕای حەزنەكردنی بەریتانییەكان بەو بەندە، ئیسپانییەكان پێیان لە سەر ئەو بەندە داگرت كە:



"پاشای بەریتانیا بە پێی داخوازیی پاشای كاتۆلیك، ڕەزامەندی لە سەر ئەوە دەردەبڕن كە بە هیچ شێوەیەك ئیزن بە نیشتەجێ بوونی جوولەكە و موورەكان لە شاری "جبل الطارق" نەدەن".

ئەو بەندە پاش پێشێلكردنی لە ساڵی ١٧٢١ دا زیاتر سەرنجی پێدرا. لە ماددەی ٧ ی ڕێككەوتننامەی نێوان بەریتانیا و مەڕاكیش كە لەو ساڵەدا مۆركرا، هاتووە كە دەبێ ئینگلیزەكان بتوانن _ بە پارێزرانی هەموو مافەكانی نێو وڵاتەكەیان _ سەفەر بۆ مەڕاكیش بكەن و بازرگانی بكەن، هەروەها زیاد كرا:

"لەگەڵ هەموو ڕەعیەتەكانی ئیمپراتۆرییدا لە موڵكەكانی بەریتانیادا بەشێوەیەكی یەكسان مامەڵە دەكرێت."

لە ساڵی ١٧٢٩ دا تێبینییەك بەو ماددیەوە زیاد كرا، زیاتر ڕوونی كردەوە:

"ئیزن بە هەموو جوولەكە و موورەكانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتوریی مەڕاكیش دەدرێ كە بۆ ماوەی سی ڕۆژ بۆ كڕین و فرۆشتن لە شاری "جبل الطارق" یان دوورگەی مۆنۆڕكادا بە سەربەستی هاتوچۆ بكەن، بەڵام مافی ئەوەیان نییە لەو شوێنانە نیشتەجێ بن و دەتوانن سەروەت و سامانەكەیان _ بە بێ هیچ گرفتێك _ بۆ هەر شوێنێكی ژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتوری مەڕاكیش بگوازنەوە."

تەنانەت ئەو سنووردارکردنانەش ماوەیەك دواتر نەمان و بە درێژایی سەدەی هەژدەهەم، سەرەڕای نارەزایەتیی بەردەوامی باڵوێزی ئیسپانیا لە لەندەن، جوولەكەكان یەك لە چوار هەتا یەك لە سێی حەشیمەتی شاری "جبل الطارق" یان پێكدەهێنا.[٢٣]

تاراوگەنشینانی موسوڵمان و جوولەكە هەتاكو چەندین پشت بۆ لەدەستدانی زێدەكەیان _ كەعەرەبەكان بە ئەندەلوس و جوولەكەكان بە سەفاراد ناویان دەبرد _ پرسەیان دەگێڕا. موسڵمانە ئەندەلوسییەكان بۆچەندین سەدە لە باكووری ئەفریقیا وەك تاقمێكی كۆمەڵایەتیی جیاواز دەناسران و شانازیان بەڕەسانەیەتیی ئیسپانی بوونی خۆیان دەكرد. ئەوان لە ئاكامدا بە ناچاری تێكەڵی باقی حەشیمەتی موسوڵمان بوون، بەڵام هیچكات زێدی خۆیان لە بیر نەكرد. هەتا سەردەمی نوێ، باڵوێزەكانی مەڕاكیش





_ جگە لە دیلەکان _ تەنیا موسڵمانێك بوون کە ئیسپانیایان دەدیتەوە. ئەوان بەدیتنی هەرشوێنێك بەم شێوەیە دڵتەنگی خۆیان بۆ شکۆی لەدەستچووی ئەندەلوس دەردەبڕی کە"انشاءالله" هەرچی زووتر خواوەند ئەو سەرزەویانە بۆ باوەشی ئیسلام دەگەڕێنێتەوە.

جوولەکە تاراوگەنشینەکانیش وەك موسوڵمانە تاراوگەنشینەکان دوای کێشەو ناکۆکییەکی زۆر لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە لە باکووری ئەفریقیا ئەوانیان بە "بەربەر" و لە ڕۆژهەڵاتدا بە "گریگوو" ناو دەبرد، لەو وڵاتەی کە لێی نیشتەجێ بوون، تێکەڵی هاوئایینەکانیان بوون. لە ئەفریقیا تێکەڵی لۆکاڵییە ئەفریقییەکان بوون بەڵام لە تورکیا و باڵکاندا هەر ئەو جوولەکە ئیسپانییانە چونکە ژمارەیان زۆر بوو و خوێندەوارییەکی باشیان هەبوو، زمان و کەلتووری خۆیان بە سەر جوولەکە یۆنانی زمانە لۆکاڵەکان _ کە لە سەردەمی شارستانیەتی بێزەنتییەوە لەوێ دەژیان داسەپاند[٢٤] .

لە دوو ناوەندی گەورەی جوولەکە سەفاڕادەکانی عوسمانیدا، واتە شارەکانی ئەستانبۆڵ و سالۆنیکی، ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە لۆکاڵی و دەرەکییەکان، نیشتەجێ کران، لایەنگرانی سیاسەتەکانی ئیمپڕاتۆریی عوسمانی بوون. دوای داگیرکردنی قوستەنتینییە لە ساڵی ١٤٥٣ دا، سوڵتانی عوسمانی دەستی بە نووژەنکردنەوەی شار و ڕێکخستن و گەشەی حەشیمەتەکەی کرد. جوولەکەکان ڕۆڵێکی گەورە و گرینگیان لەو بوارەدا لە ئەستۆ بوو. ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان بە زۆر لە ناوچەکانی ترەوە بۆ پایتەختی نوێ کۆچیان پێکرا. بەڵام کاتێك کە ژمارەی جوولەکەکان بە ڕێژەی خوازراو نەگەیشت، دەرگایان بە ڕووی پەنابەرانی دەرەکیدا کردەوە.

ڕەنگە سەرنج ڕاکێش بێ کە بزانین ژمارەی دانیشتووانی سالۆنیکی _ بە پێی بەڵگەکانی تورکیا_ دوای داگیرکردنی ئەو شارە لە ساڵی ١٤٣٠ بە گشتی لە یۆنانییەکان و ژمارەیەکی کەم لە تورك و ژمارەیەکی کەمتریش لە کاتۆلیکەکان پێکدەهات. سەرژمێرییەکی تر لە ساڵی ١٤٧٨ دا بوونی هیچ جوولەکەیەك لەو شارەدا نیشاننادا. نزیك بە نیو سەدە دوای ئەمە، لە لێنووسێکی بێ بەروار لە سەردەمی سوڵتان "سولەیمانی قانوونی" دا لانیکەم ئاماژەی بە بیست کۆمەڵی جوولەکە کردووە.



تاکو سەرەتاکانی سەدەی هەڤدەهەم ژمارەی کۆمەڵەکانی جوولەکەکان بۆ بیست و پێنج دانە زیادی کرد. لەو سەردەمەدا، جوولەکەکان زۆرترین حەشیمەتی سالۆنیکیان پێکدەهێنا و ئەو هێژمۆنییە حەشیمەتییە تاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم درێژەی هەبوو.

سالۆنیکی بۆ ماوەی چوار سەدە ناوەندی ئابووریی عوسمانییەکان لە ئەورووپا و ناوەندی کەلتووریی جوولەکە سەفاڕادییەکان بوو. ئەو ناوەندە کەسانێك پێکیان هێنابوو کە لە نێوان بەدیلی تاراوگە یان گۆڕینی ئایین، تاراوگەنشینیان هەڵبژاردبوو. بەشێکی زۆر لە نەوەکانی ئەو کەسانە لە سەدەی بیستەمدا، کاتێك یۆنان لە لایان ڕایخی سێهەم داگیرکرا، لە ئۆردوگاکانی نازیدا سووتێنران. ئەوان بە دڵنیاییەوە پێیان خۆش بوو کە وەك ئیسپانیای کاتۆلیکیی سەدەی پازدەیەم مافێکی دیکەی هەڵبژاردنی ئازادیان بدرێتێ.

دوای ڕیشەکێشکردنی ئیسلام و جوولەکایەتی لە ئیسپانیا، لە هەر دوو ئاییندا کەسانێك هەبوون کە بۆ زیندووڕاگرتنی سەرکەوتنەکان و تێکشکانەکان تێدەکۆشان. مێژووناسانی جوولەکە لە فەڕەنسا و ئیتاڵیا و تورکیادا ژیاننامە و مێژووی شەهیدانی خۆیان نووسییەوە، کە لەودا ئیسپانیا و پورتوگال ڕۆڵێکی گرنگیان دەگێڕا، هەرچەندە تەنیا وڵاتگەلێکی ڕۆڵگێڕ نەبوون. لێکۆڵەرەوەکانی تری جوولەکە قۆڵیان لە پاراستن و بڵاوکردنەوەی نووسراوەکانی شاعیران و فەیلەسووفە گەورەکانی جوولەکە لە سەدەکانی نێوەڕاست، هەڵماڵیبوو. لە سەدەی هەڤدەهەمدا ئەدیب و زانایەك لە موسوڵمانەکانی باکووری ئەفریقیا بە ناوی " احمد ابن محمّد مقری" ژیانی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی ئیسپانیای موسوڵماننشین تەرخانکرد و بەرهەمێکی نەمری لەبارەی مێژوو و ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەوە لە پاش خۆی بە جێهێشت.[٢٥]

بەڵام تەنانەت ئەو بیرەوەرییانەش وردە وردە لەنێو چوون، تا ئەوەی کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، سەرهەڵدانەوەی ژیانی ڕۆمانتیك لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا هۆگرییەکی نوێی بە لای ئیسپانیای سەدەکانی نێوەڕاستی جوولەکەکان و





موسوڵمانەکان، خولقاند. لەو سەردەمە دابوو کە شانۆنامەی "ئێرنان" ی "ڤیکتۆر هۆگۆ" کە لە ساڵی ١٨٣٠ دا نمایشکرا و کتێبی "سەفەرێك بۆ ئیسپانیا" لە نووسینی "تئۆفیل گوتیە" کە لە ساڵی ١٨٤٥ دا بڵاو کرایەوە، پڕۆسەیەکی نوێیان لە پاریسەوە ڕێخست و کتێبەکانی"گرتنی غەرناتە" و "چیرۆکەکانی الحمرا" لە نووسینی "واشنتۆن ئێرڤینگ"، لە وڵاتانی ئینگلیزی زمان، ناوبانگێکی زۆریان پەیدا کرد. لە ساڵی ١٨٣٣ دا نووسەرێکی فەرەنسی بە ناوی "لوویی ڤییاردۆ" کتێبی "مێژووی عەرەبەکان و موورەکانی ئیسپانیا" ی نووسی. چەند ساڵ دواتر، یەکێك لە پێشرەوترین ڕۆشنبیرانی تورکیا لەو سەردەمەدا ئەو کتێبەی وەرگێڕایە سەر زمانی تورکی و دەرگای لێکۆڵینەوەی لە ئیسلامی ئیسپانی لە ڕۆژهەڵاتی موسڵماندا کردەوە. لە ساڵی ١٨٤٦ دا جوولەکەیەکی سەفاڕادی بە ناوی "ئەلیاس حییم لیندۆ" لە لەندەن کتێبی " مێژووی جوولەکەکانی ئیسپانیا و پورتوگاڵ" ی بڵاو کردەوە. ناوبراو کە کوڕە پووری "بنجامین دیزریلی" بوو، بە نووسینی ئەو کتێبەی، بووە هۆی زیاتربوونی غروری سەفاڕادی و تێڕوانینێکی ئەفسانەیی دا بەرۆڵ و پێگەی جوولەکان لە ڕۆمانەکانی کوڕە پوورە ناسراوەکەی.

جوولەکەکان و موسوڵمانەکان ئیسپانیایان وەك دەرکراوێك، بە جێهێشت و زۆربەیان بۆ دۆزینەوەی سەرپەنایەك ڕوویان لە باشوور و ڕۆژهەڵات کرد. بەڵام هەر لەو سەردەمەدا مەسیحییەکانیش لە حاڵی جێهێشتنی ئیسپانیا بوون، بەڵام نەك بۆ لای ڕۆژهەڵات و باشوور، بەڵکو بۆ لای ڕۆژئاوا" نەك وەك دەرکراوێك، بەڵکو وەك سەرکەوتوو و داگیرکەرو، دۆزەرێکی تاڕادەیەك بە سوتفەی دنیایەکی نوێ.

لەکۆتاییەکانی سەدەی سێزدەهەم، ئەوکاتەی کە هێشتا مەسیحییەکان بە تەواوەتی ئیسپانیایان داگیر نەکردبوو، یەکێك لە تیۆرە مەزنەکانی شەڕی مەسیحییەت لەگەڵ ئیسلام بەناوی "ڕامۆن لوون" ئەو ڕایەی دەربڕی کە هەر کاتێك گرتنەوەی ئیسپانیا ئەنجامدرا، پێویستە کە شەڕەکە بۆلای گەرووی"جبل الطارق" درێژ بکرێتەوە[1]. ناوبراو تەنیا کەسێك نەبوو کە خاوەنی ئەم ڕایە بێ. تیۆرانین و ئاواتی لەم چەشنە بە ئاشکرا سەرکردەکانی ئیسپانیا و پورتوگالی _ تەنانەت دوای ئازادکردنی سەرزەمینەکانی باب و باپیرانیان - بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هاندەدا. هەر ئەم ڕایە بووە هۆی ئەوەی کە رووسەکان، دوای رزگارکردنی مۆسکۆ لە دەستی تاتارەکان، سەرکردەکانیان هەتا وڵاتی تاتارستان راونان.

ئەوان لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە بە دەرکردن و راونانی موسڵمانەکان لە ئیبریا و رووسیادا تەنیا لە شەڕێکی ناوچەییدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بەڵام شەڕی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت لە پانتایەکی بەرفراوانتردا هەروا درێژەی هەیە. ئیسپانییەکان و پورتوگالییەکان بەردەوام خۆیان لە شەڕ لەگەڵ موسڵمانەکاندا هەستپێدەکرد چوونکە تەنانەت موسڵمانەکانی وڵاتانی دوورەدەستی وەك سەیلان و فیلیپینیشیان بە موور دەزانی.

دیارە قۆناغی نوێی ئەو "کێشە گەورە"یە _ بەوتەی گیبۆن(*)، مێژوونووسی بریتانی _ لایەنێکی تر و کردەیی تریشی هەبوو. کاتێك "واسکۆداگاما"، دۆزەرەوەی پورتوگالی، چەند ساڵ دوای چوونی کریستۆف کۆلۆمب، چووە نێوخاکی هیندوستان و گوتی کە بە دوای مەسیحییەت و بەهاراتدا هاتووە، لەراستیدا ئاماژە بە دووفاقێتیی ئەو سەفەرە دۆزەرەوانە دەکا. ئەو سەفەرانە لەلایەك هەنگاوێکی گرینك بەرەو شەڕێکی ئایینی جیهانی

(*) مێژوونووسی ئینگلیزی.



و لەلایەکی تر بە مەبەستی پەرەپێدانی ئابووری و کورتکردنەوەی دەستی نێوبەندەکان و گەیشتن بە بەرهەمهێنەری سەرەکی بوون.

بەواتایەکی تر، ئەو دوزێنەوانە درێژەی ئەو ناکۆکییانە بوون کە بۆ بەر لە ئیسلام و مەسیحییەت دەگەڕانەوە ئەو سەردەمەی کە ئیمپڕاتۆرە نەیارەکان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا بریتی بوون لە ئیمپڕاتوریی ئێران و ڕۆم. ئێران ڕێگای ڕۆمی بەرۆژهەڵات بەستبۆوە و ئەوان هەوڵی ئەوەیان دەدا کەرێگایەکی راستەخۆی بازرگانی لە چین (وڵاتی ئاوریشم) بۆ هیند (وڵاتی دار) و بەئاسیای باشووری رۆژهەڵات کە سەرزەمینی بەهارات بوو، ببەستێتەوە. لەم رووەوە هەردوولا لە دەرەوەی سنوورەکانیاندا هەوڵی دۆزینەوەی زیاتریان دەدا. بەمەسیحیبوونی رۆمییەکان و بەموسڵمانبوونی ئێرانییەکان لایەنێکی ئایینی، هەروەها رەهەندێکی عەسکەری و ئیستراتیژیەکی تازەیان بە ململانێ کۆنەکانەوە زیاد کردبوو.

داگیرکەرانی ئەوبەروبەری ئەوروپا هۆکاری سەلمێنەریان بۆ بەدواداچوونی دوژمنە لەحاڵی پاشەکشەکانی خۆیان هەبوو. ئەوان دەبوایە پێشگیری لە یەکگرتنی دووبارە و دژە هێرشی چاوەڕواننەکراوی ئەوان بکەن. مەیلێکی زۆر بۆ تێکشکاندنی گەمارۆی گازانبری موسوڵمانەکان _ کە لە سەدەکانی نێوەڕاستەوە لەلای رۆژهەڵات و باشوورەوە هەرەشەی لە ئەوروپا دەکرد _ پێکهاتبوو. هەروەها، ئەوە ئاواتی لە مێژینەی ئەوروپییەکان بوو کە بە دۆزینەوەی هاوکیش و ئایین و شەریکە بازرگانییەکان و تەنانەت رەنگە چەند هاوپەیمانێك لەوپەڕی سنوورەکانی رۆژهەڵات و باشووری دونیای ئیسلام دا، موسوڵمانەکان غافڵگیر بکەن.

لە سەدەکانی نێوەراستدا خەیاڵی پێکهێنانی بەرەیەکی دووهەم دژی ئیسلام جارێکی تر بیر و زەینی سیاسەتڤان و نووسەرانی ئەوروپی بەخۆیەوە خەریککرد. لەلایەك بووە هۆی پەرەگرتنی پێوەندیی لەگەڵ مەغولەکان،





حەبەشییەکان و تەنانەت شیعەکانی ئێران لەلایەیەکی تر پەرەیدا بە ئەفسانەی متلو ن "یۆحنای قەشە". ناوبراو پاشای گەورەی مەسیحییەکانی رۆژهەڵات بوو کە پێگەی جۆراوجۆریان بۆ دانابوو و پێیان وابوو کە رۆژێك دێتە نێو رەیزەکانی سوپای مەسیحییەکانی ئەوروپا و زەربەی نەهایی لە سوپای ئیسلام دەدا. ئەم ئوستوورەیە بۆیەکەم جار لە سەرچاوە رۆژئاواییەکان و لە نووسینەکانی "ئۆتوو" _ میژوونووسی ئەڵمانیی کەنیسە و قەشەی فرایزینگ _ دا دەبینریێ. "ئۆتوو" دەڵێ کە لە ساڵی ١١٤٥لە چاوپێکەوتنم لەگەڵ قەشەی شاری " جبیل"ی لوبنان لە ڤیتەربۆی ئیتاڵیا دا، پێم گوت:

"لە ساڵانێکی نە زۆر کۆندا، پاشا و قەشەیەك بە ناوی" یۆهانس" لە رۆژهەڵاتی دوور _ ئەوبەری ئیران و ئەرمەنستان _ دا دەژیا. ناوبراو کە وەك هەمووخەڵکی وڵاتەکەی مەسیحییەکی نەستۆوری(*) بوو، شەڕێکی لەگەڵ پارس و مادەکان دەستپێکرد و پایتەختی ئەوانی تەخت کرد... باوکە یۆهانس لە ئاکامدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و بەکوشتاری بێ بەزەیانەی ئەوان، پارسەکانی ناچار بە ڕاکردن کرد."[٣]

قەشە ئۆتوو درێژە دەدا کە باوکە یۆهانس دوای ئەم سەرکەوتنە، بۆ مەبەستی هاوکاریکردنی خەڵکی ئۆرشەلیم بەرەو ئەوێ رۆیشت بەڵام چونکە نەیتوانی سوپاکەی خۆی لە دیجلە بپەڕێنێتەوە ڕووی لە باکوور کرد و بەهۆی سەرمایەکی توندەوە ناچار بوو بەرەو وڵاتەکەی بگەڕێتەوە.

---

(*) شوورای مەسیحییەکان "نەستۆریوس"ی لە ساڵی ٤٣٨دا بەهەڵگەڕانەوە تاوانبار کرد. نابراو لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە لە عیسای (مەسیح)دا خوا و مرۆڤ تێکەڵ بەیەکتر بوونە، بەڵام نابێ مریەم بە دایکی خوا بژمێردرێ. مەسیحییە کۆنەکانی ئێران ئەم بڕیارەی شووڕایان رەتکردەوە و درێژەیان بە پەیڕەوی کردن لە ناوبراو داو، ناویان بەنەستۆری دەرکرد. ئەمڕۆ کە ئاشوورییەکانی ئێران و عێڕاق سەر بە پەیڕەوانی ناوبراو دەژمێردرێن.



میژوونووسانی نوێ پێیان وایە کە ئەو داستانە سەیرە رووداوێکی میژوویی دەخاتە روو: شەڕی قەتوان لە رۆژهەڵاتی سەمەرقەند لە ئەیلوولی ١١٤١، کەلەودا سوڵتان سەرنجەری سەلجوقی لەبەرانبەر قەراختائییەکاندا شکستی خوارد. قەرختائییەکان وەك زۆربەی خەڵکی بیابانەکان بوێر و لەسەرخۆ و لە بواری ئایینییەوە کەسانێکی نەرم و خۆینسارد بوون. بەپشتیوانی ئەوانە، کەنیسەی نەستووری لە ئاسیای نێوەراستدا گیانێکی تازەی بە خۆوە گرت و توانی چالاکی و پڕوپاگەندەیەکی بەرفراوان دەستپێبکا.

سەرەڕای خۆپارێزیی ئۆتوو کە هیوایەکی بە رزگاربوون لەدەستی رۆژهەڵات نەبوو، بەڵام هەواڵی شکستی موسڵمانەکان بە دەستی هێزێکی تازە، بەڵام غەیرە مەسیحی، بە ورە و بووژانەوە بۆ کەنیسەی مەسیحی دەژمێردرا و خۆشی و شادییەکی زۆری لە ئەوروپادا دروستکرد. ئەم خۆشی و شادییەی ئەوروپییەکان سەدەیەك دواتر بە بیستنی هەواڵی گیرانی بەغدا لەلایان مەغوولەکانەوە، بە لوتکە گەیشت. نەك تەنیا مەسیحییەکی زۆر _ ئەگەرچی نەستووری و دابڕاو - لەنێو مەغوولەکاندا هەبوون، بەڵکو ژمارەیەکی زۆریش لەوان لە دەوڵەتی مەغوولدا بە پۆستی فەرماندەری گەیشتبوون. ئەورپییەکان لە روالەتدا کاتێك زیاتر بە ئاواتەکانیان گەیشتن کە مەغوولەکان لەمانگی مارتی١٢٦٠دا دەستیان بەسەر دیمەشقدا گرت و سێ ئەمیری مەسیحی شان بە شانی یەکتر لە شەقامەکانی شاری داگیرکراوی موسڵمانەکاندا ئەسپەکانیان لینگدەدا. ئەو سێ کەسە بریتی بوون لە: کتبووقای نوئایۆنی فەرماندەی مەغوول و بەرەگەز تورك و مەسیحیی نەستووری" بۆهمووندی شەشەم، خەزووری ناوبراو واتا هێسوم لە ئیماراتی تازە دامەزراوی ئەرمەنی _ فەرەنسایی سیسیل.

بەڵام ئەم هیوایە زۆری نەخایاند. دیمەشق دیسان کەوتەوە دەستی موسڵمانەکان. پاپا، بۆهمووندی تەکفیر کرد و مەسیحییەکانی دیمەشق ناچار بە





دانی باج کران. مەغوولەکانیش سەرەڕای هەوڵی قەشەکان بۆ بەمەسیحی کردنیان، هەوڵی سیاسەتڤانە مەسیحییەکان بۆ دامەزراندنیان، ڕوویان کردە ئیسلام. ڕووکردنی مەغوولەکان بە ئایینی خەڵکی وڵاتێك کە داگیریان کردبوو، زەربەیەکی گەورە بوو لە پلانەکانی مەسیحییەکان و پشتیوانییەکی مەزنیش بوو بۆ بەرەی ئیسلام .

بەوحاڵە، ئەم ڕووداوە خاڵی کۆتایی بۆ هیوا و دۆزینەوەکانی مەسیحییەکان نەبوو. لە سەدەی پازدەهەمدا هەوڵ بۆ پەیداکردنی هاوپەیمانێکی مەسیحی، بۆ پێکهێنانی بەرەی دووهەم، ڕوو لە ئەفریقیا کرا. بەداخەوە هەم لە سەرچاوە عەرەبییەکان و هەم لە سەرچاوە ڕۆژئاواییەکاندا جاروبار تەنیا ئاماژەیەکی کورت بە وتووێژەکانی نێوان ئەوروپا و حەبەشەی مەسیحی بۆ ئەنجامدانی هێرشی هاوبەش کراوە. ئەم وتووێژانە وەك پێویستییەك دەبوایە نهێنی بن، چونکە ڕێڕەوی پێوەندیی نیوان ئەم دوو لایەنە بە نێو وڵاتانی ژێردەسەڵاتی موسڵمانەکاندا تێدەپەڕی. مێژووزانانی میسری باس لە داستانێکی سەرسووڕهێنەر دەکەن کە لە ساڵی ١٤٢٨دا بازرگانێکی ئێرانی بە تاوانی ناوبژیوانی لەنێوان دەسەڵاتدارانی حەبەشە و فەرەنسا بە مەبەستی ڕێکخستنی هێرشێکی هاوبەش بۆ سەر وڵاتانی موسڵمان و لە نێوبردنی ئیسلام، دەسبەسەر و دادگایی و لە سێدارە دەدرێ[٤]. بێگومان ئەو پلانانە هیچ ئاکامێکی نەبوو، بەڵام گەڵاڵەی گەورەی غافڵگیرکردنی ئیسلام و کردنەوەی بەرەیەکی تر، چەندین ساڵ بیری تێکۆشەران و دۆزەرەوانی مەسیحی بە خۆیەوە خەریککرد.

واسکۆداگاما، بازرگانیی بەهاراتی بە دووهەمین ئامانجی مەسیحییەکان ناوبرد" ئەوانیتر ڕەنگ بوو یەکەم جار ناوی بەهارات بەرن و بە سومبولی کۆمەڵێکی گەورە لە مەبەستەکانیان بیژمێرن. دیارە پاڵنەرە ئابوورییەکان گرینگییەکی زۆریان هەبوو چونکە سەرچاوەکانی فلزە بەنرخەکانی ئەوروپا



بەرەو تەواوبوون دەچوون و هۆگرییەکی زۆر بە کانەکانی زێڕ و کاروانی گواستنەوەی زێڕ و ئالتوون لە سەحرای ئەفریقیادا، لە لای خەڵك دروستببوو. سەرنجدان بە هاوردەی شەکر لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستیشەوە ڕووی لە زیادبوون کردبوو. لەو سەردەمەدا، چاندنی قامیشی شەکر لە دوورگەکانی زەریای ئەتڵەس، قۆناغێکی گرینگی لە دۆزینەوەکانی زەریای ئەتڵەسدا تۆمارکرد. لە هۆکارەکانی تر دەکرێ ئاماژە بە پەلەی زۆری بازرگانان و بەکارهێنان ئەوروپییەکان بکرێ لە داواکاریی لەڕادەبەدەری دەلاڵ و باجگرانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و حەزی بەدەستهێنانی سەرچاوە سەرەکییەکانی بەهارات لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

لەم بەستێنە مێژووییە بەربڵاوترەدا دەکرێ ئاسانتر پەی بە مەیلی ئەوروپییەکان بۆ هێژمۆنی _ لەکۆتاییەکانی سەدەی پازدەهەمدا _ ببردرێ. ئەوە بۆ ئیسپانییەکان و پورتوگالییەکان شتێکی سروشتی بوو کە دوای ڕزگارکردنی وڵاتەکانیان لەدەستی موسوڵمانەکان، بۆ دڵنیابوون لە دووبارە نەگەڕانەوەیان، دەسەڵاتدارانی پێشووی خۆیان هەتاکو گەرووی "جبل الطارق" ڕاو بنێن. ڕووسەکانیش هەر بەم هۆیەوە دوای تێکشاندنی تاتارەکان، ئەوانیان تاکو بارەگاکانی پێشووی خۆیان ڕاونا. ئەوە ڕوونە کە ناکرێ دوای شەڕێکی دژوار و دوور و درێژی ئایینی چاوەڕوانی ئەوەت هەبێ کە لایەنی سەرکەوتوو تەنیا بە ڕاونانی دوژمنەکەی دابمرکێ، تەنیا لەبەر ئەوەی گەیشتبوونە هێڵێکی گریمانەیی نێوان شتە بەرچاوەکان. لە ڕوانگەی ڕووسەکان و ئیبیرییەکانیشەوە، ئەوروپا بە مانای مەسیحیەت بوو، سنووری ڕۆژهەڵات و باشوورەکەشی ئیسلام بوو. هەروەها ئەوەش ڕوون بوو کە سنووری نێوان ئەو دوو نەیارە ئایینی و شارستانیەتە جیهانییە سنوورێکی جوغرافیی سەقامگرتووی نەبوو، تەنیا بە سەرکەوتنی نەهایی لایەنێك بەسەر ئەویتردا دەکرا ئەم سنوورە هەبێ. موسڵمانەکانیش کە لە سەدەی حەوتەمەوە شەڕێکی گەورە و دووردرێژیان بە





شێوازی جۆراوجۆر و لە شۆینی جیاواز لەگەڵ مەسیحییەکاندا دەستپێکردبوو، تەنانەت لە سەردەمی دۆزینەوەی ئەمریکاش بە فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان کە لە کەناری دانووبدا سەرقاڵی شەڕبوون، هەمان شێوە بیرکردنەوەیان بەرانبەر بە مەسیحییەکان هەبوو.

دنیای کۆن بە شێوەیەکی سوننەتی بەسەر سێ کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا دابەش دەبوو. " پلینی" لە کتێبی "میژووی سروشتی " وێنا و پێناسەیەکی روون و سادە لەمبارەوە دەخاتە روو:

"زەوی بەسەر سێ بەشی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیادا دابەشدەبێ. خاڵی دەستپێك لە رۆژئاوایە و گەرووی "جبل الطارق" کە دەچێتەوە نێو زەریای ئەتڵەس. کاتێك کە لە زەریاوە دەچێتە نێو دەریا، ئەفریقیا دەکەوێتە لای راست، ئەوروپا لەلای چەپ و ئاسیاش لەنێوان ئەو دووانە دایە. چۆمەکانی دۆن و نیل بە درێژایی لە نێوان ئەواندا تێدەپەڕن"[٥].

ئەو پێناسەیە بە ئاشکرا لە کۆمەڵگایەك کە دنیاکەی لە دەریای مەدیتەرانە، کەنارەکانی و وشکاییەکانی سەرووی ئەو دەریایە پێکدێ، هەڵقوڵاوە و وەك زۆربەی زانستەکان و فەلسەفەی رۆمی، لە نووسراوەکانی یۆنانی وەرگیراوە کە ئیستاش زۆربەیان هەر ماون. لەو نووسراوانەدا کیشوەری باشووری بە ئەفریقیا ناو نابردرێ بەڵکو بە لیبیا ناو دەبرێ" بەڵام دوو ناوەکەی تر هەر وەك خۆیان بەکار هاتوون. ناوی لیبیا بە شێوەی جۆراوجۆر لە تەورات و دەقەکانی میسری کۆندا هاتووە و ئاماژە بە ناوچە و خەڵکێك دەکا لە رۆژئاوای میسر. لیبیا تەنیا لە زمانی یۆنانیدا پێی دەگوترێ کیشوەری باشووری.

لە هەموو دەقە کۆنەکاندا کە ئاماژە بە ناوەکانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیا کراوە، هەموویان لاتینی و یۆنانی و لەئاکامدا ئەوروپین. لە زۆر نووسراودا کە لە شارستانیەتە کۆنەکانی ئاسیا و ئەفریقیا بەجێماون تەنانەت



ئاماژەیەك بەو ناوانە نەکراوە. ئەم بابەتە دەربڕی ئەوەیە کە تەنانەت ئەگەر ئەو زانیارییانە لە لایان دۆزەرانی فینیقییەوە بەدەستهاتبێ، جوغرافیای جیهانیی سێ کێشوەری لە لایان یۆنانییەکانەوە دروستبووە. یۆنانییەکان و پاشان رۆمییەکان ئەوروپایان بە نیشتمانی خۆیان دادەنا و ئاسیا و ئەفریقیایان بە هاوسێکانی خۆیان دەژمارد" بەلام ئاسیایی و ئەفریقییەکان خۆیان بەو ناوانە نەدەناسی، ئەوروپاش _ لە قوناغە جۆراوجۆرەکاندا _ بە پێی جۆری پێوەندییەکەی لەگەڵ یۆنان، رۆم و مەسیحییەتدا خۆی پێناسە کردووە.

ئاسیا و ئەفریقیا، بە پێی تایبەتمەندییە رەگەزی و کەلتووری و ئایینییەکەیان، بە بەربەر و غەیرە جوولەکە ناو دەبران. دیارە بەربەرەکان خۆیان بە بەربەر و غەیرە جوولەکەکان خۆیان بە غەیرە جوولەکە نەدەزانی هەتا ئەوەی کە بوون بە مەسیحی و فێرکران خۆیان بەم شێوە بناسن. هەر بۆیە لەو بەستێنەدا، ئاسیا بە واتای "رۆژهەڵاتی غەیرە ئەورووپی" و ئەفریقیا و لیبیا بە مانای "باشووری غەیرە ئەورووپی" بوون. هێندێك لە فەیلەسووفە کۆنەکانی وەك ئەرەستۆ پێ لەوەش زیاتر هەڵدەبڕن و ئەوروپا بە یەکسان لەگەڵ ئازادی و سەربەخۆیی و سەروەریی یاسا دادەنێن و هاوسێکانی بە یەکسانی لەگەڵ سەرەڕۆیی و کۆیلەداری. ئەو ڕوانگەیە ئێستاش لە ئەنجوومەنەکانی یەکیەتی ئەوروپادا دووپاتدەکرێتەوە.

بە دڵنیاییەوە دانیشتوانی ئاسیا و ئەفریقیا بەم شێوەیە لە خۆیان نەدەڕوانی، تەنانەت بە پێی هێندێك بەڵگە ئەوان نەیاندەزانی کە ئاسیایی و ئەفریقین" هەر وەك چۆن دانیشتوانی ئەمریکای بەر لە کۆلۆمب نەیاندەزانی کە ئەمریکین. ئەوە ئەورووپییەکان بوون کە فێری ئەم دابەشکردنەیان کردن و بە سەر خەڵکی ئەوێیاندا سەپاند.

کەوابوو جێی سەرسووڕمان نییە کە ئەوروپا سەرەڕای بوونی چەندین نەتەوە و زمانی جۆراوجۆر،خاوەنی ناسنامەیەکن — لە بوارەکانی کەلتووری و





بەهاکان، ئایین و بنیاتەکان، زانست و هونەر و تەنانەت مۆسیقاش - . هەتاکو ئەم دوایانە، خەڵکی ئەوروپا لە یەك ڕەگەز بوون، لەحاڵێکدا کە ئەفریقیا بە تایبەتی ئاسیا جۆراوجۆریی ڕەگەزیی زیاتری هەیە. بۆ وێنە جیاوازی نێوان سیسیلییەکان و سویدییەکان، یان پۆلۆنییەکان و پورتوگالییەکان، زۆر کەمترە لە جیاوازیی نێوان ئێرانییەکان و چینییەکان، هیندییەکان و ژاپۆنییەکان و میسرییەکان لەگەڵ زیمبابۆییەکان. ئەوروپا بوو بە ئەوروپا. ئەوروپا ئەمریکای دۆزییەوە، لە ڕاستیدا خەڵقی کرد" چوونکە هەموو یەکە سیاسییەکان لە نیوەگۆی ڕۆژئاوادا، لە باکوورەوە هەتا باشوور، لە سەر بنەمای نموونە ئەوروپییەکان دامەزران و بە زمانی ئەوروپی دەدوان. ئەوە لە حاڵێك دایە کە ئەوروپا، نە ئاسیا و نە ئەفریقیای نەدۆزینەوە و نە خەڵقی کردن، بەڵکو ئەوانی داهێنا. ئەوە گەورەترین گەپی سەردەمی ئێمەیە کە لە سەردەمێکدا کە شەپۆلی ناڕەزایەتی بە دژی ئەوروپا سەنتەری لە ئارا دایە، ژمارەیەکی زۆر لە غەیرە ئەوروپییەکان ڕوانگەیەکی ئەوروپا سەنتەرانەیان بۆ دنیا هەیە و خۆیان بە ناسنامەیەکەوە دەنوێنن کە ئەوروپییەکان بە سەریدا فەرز کردوون.

لە بواری مێژوویی و کەلتووری و تەنانەت ڕەگەزیشەوە سنوورێکی ڕاستەقینە لە نێوان ئەوروپا و هاوسێکانی ڕۆژهەڵات و باشووردا نەبوو. لە ڕاستیدا، ئەو بەشانەی کە ڕۆمییەکان و یۆنانییەکان لە ئاسیا و ئەفریقیادا دەیانناسین و ناویان لێنابوون، خاڵی هاوبەشی زیاتری لە گەڵ ئەوروپادا هەبوو هەتاکو شوێنە دووردەستەکانی کیشوەرەکەی خۆیان. هەموو کات دەریای نێوەڕاست کەمتر جیاکەرەوە بووە تاکو بۆ وێنە سەحرای ئەفریقیا یان کێوە سنوورییەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی ئێران. ئیسلام و مەسیحییەت بە بەراورد لە گەڵ ئایینە گەورەکانی چین و هیند وێکچوونی زیاتریان بەیەکەوە هەیە. لە بواری ڕەگەزیشەوە دانیشتووانی ئاسیای ڕۆژئاوا لە کەنارەکانی دەریای نێوەڕاست وێکچوونی زیاتریان لە گەڵ ئەوروپییەکاندا هەیە هەتاکو لە گەڵ



ئاسیاییەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور. لەڕاستیدا سنوورێکی دیاریکراو لە نێوان سپی پێستەکان و ئەوانیتر لە هیچ شوێنێکی دەوروبەری ئەوروپادا نییە. تەنیا دەکرێ پلەبەندییەك هەبێ، لە باکوورەوە هەتا باشوور، لە ئەسمەر و قاوەیی و ڕەش.

یۆنانییەکان بە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ئیجەیان دەگوت ئاسیا" لە حاڵێکدا کە کەناری ڕۆژئاوای ئەو دەریایە ئەوروپا بوو. کاتێك کە خاڵی دوورتریان لە ئاسیا ناسی، ناوی سەرزەمینەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ئیجەیان لە ئاسیایەوە بۆ میکرۆئاسیا یان ئاسیای بچووك گۆڕی تاکو لە هیند و ئێران و چین جیا ببێتەوە و کاتێك کە کاروباری چین و ژاپۆن سەرنجی ڕۆژئاوای بۆ لای خۆی ڕاکێشا، ئاسیا بە سەر سێ بەشی ڕۆژهەڵاتی نزیك، ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی دوور دابەشکرا.

زاراوەی ئاسیا کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریی ڕۆم و شارستانیەتی بێزەنتیدا ناوی ئەیالەتێك بوو، دوای هێرشی موسڵمانەکان و داگیرکەرانی سووریا بە دەستی عەرەبەکان و گیرانی ڕۆمی ڕۆژهەڵات بە دەستی تورکەکان ڕەواجی خۆی لەدەستدا.

لە ڕوانگەی ڕۆمییەکانەوە، ئەفریقیا، کەناری باشووری دەریای مەدیتەرانە و زێدی کارتاژ، دوژمنی گەورەی ئیمپراتۆریی ڕۆم بوو. ئیسیکیپۆ _ سەرداری ڕۆمی _ کە بە باشی شارەزای ئەو مەترسییە بوو، نازناوی "ئەفریقیا نووس" ی پێ بەخشرا چوونکە ئەفریقیای داگیر کرد، نەك ئەوەی کە لە ئەفریقیا لەدایکبووبێ. لەئاکامدا ئیمپراتۆریی ڕۆم ئەو شوێنەی کە بە ئەفریقیای ناو دەبرد و نزیك بە تەواوی توونسی ئەورۆیی و ڕۆژهەڵاتی جەزایر و ڕۆژئاوای لیبیای لەخۆ گرت، بەدەستهێنا. زاراوەی ئەفریقیا بە پێچەوانەی ئاسیا دوای هێرشی عەرەبەکان لە سەدەکانی حەوت و هەشتیشدا مایەوە و دەسەڵاتدارە تازەکانی، ئەم ناوەیان هەم لە بواری جوغرافی و هەم لە بواری دابەشکردنی ئیدارییشەوە بۆ ئەم ناوچەیە بەکار دەهێنا" بەڵام ئەفریقیا میسر و مەراکیش و





ولاتانی باشوورتری، کە عەرەبەکان پێیان دەگوت "بلادالسودان" واتە ولاتی قولەرەشەکان، لەخۆ نەدەگرت. "بلادالسودان" لەسەرەتادا بەهەموو ناوچەکانی باشووری سەحرای ئەفریقیا لە زەریای ئەتڵەسەوە تاکو دەریای سوور و زەریای هیند دەگوترا. بەڵام لە سەردەمی نوێدا تەنیا دوو وڵاتی لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لە خۆ دەگرت. دانیشتوانی سوودان دانیشتووانی قاوەیی پێستی باکووری ناوچەکەیان بە سوور و دانیشتوانی رەش پێستی باشووریان بە شین ناودەبەن.

هەر بۆیە موسڵمانانی جیهانیان بە دوو شێوە دابەشدەکرد: یەکیان بەشێوازی جوغرافی و ئەویتریان بەشێوازی ئایینی وسیاسی. لە نووسراوە و سەرچاوە جوغرافییەکانی موسڵمانەکان بە زمانی عەرەبی، فارسی، تورکی و زمانەکانی تر، دنیا بە سەر چەند هەرێمدا دابەشدەبێ[٦]. دابەشبوونی هەرێمەکان تەنیا جوغرافییانەیە و لایەنی ئایینی و کەلتووری و سیاسی نییە. لە روانگەی موسڵمانەکانەوە، دابەشبوونی جیهان بۆ سەر ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام دان و ئەو وڵاتانەی کە تا ئیستاش نەبوونەتە موسڵمان، گرینگییەکی زۆری هەبوو. ئەوان لە پێشڕەوییەکانی خۆیان بەرەو ئاسیا و ئەفریقیا، بەپێچەوانەی ئەوروپا، لەگەڵ هیچ هێزێکی عەسکەری و رکابەری ئایینیی بەهێزدا بەرەورِوو نەبوونەوە .

ئەم دوو ئایینە بە شێوەیەکی سەرسوورِهێنەر تێگەیشتنێکی وەك یەکیان لە سەر یەکتر هەبوو. هەردوولا، یەکتریان بەگەورەترین رکابەری خۆیان دەزانی، بەڵام حەزیان نەدەکرد دانی پێدا بنێن. مەسیحییەکان بە جێگای ئەوەی کە دوژمنانی خۆیان بە موسڵمان ناوبەرن وایان بە باش دەزانی کە لە ناوە نەتەوەییەکانی ئەوان وەك موورەکان یان بادوورەکان، تورکەکان و تاتارەکان کەڵك وەرگرن. موسڵمانەکانیش بەم شێوەیە کاتێك کە لەبارەی دانیشتووانی ئەوروپا و تەنانەت لە بارەی شەرِکەرەکانی سەلیبی دەدوان، ئەوانیان بە



یۆنانییەکان، رۆمییەکان، فرانکەکان و ئۆسلاوییەکان ناودەبرد. هەردوو لایەن کاتێك کە پێویست بوایە لایەنەکەی تر لە بواری ئایینییەوە پێناسە بکا ئەوا یەکتریان بە کافر ناودەبرد، مانای وەك یەکیان هەبوو و تەنیا لەدەربرِیندا جیاوازییان هەبوو.

ئەوروپا و خوشکەکانی، ئاسیا و ئەفریقیا، سەر لە نوێ لە نووسەراوەکانی سەردەمی رێنسانس و بووژانەوەی زانستەکانی یۆنانیدا دەردەکەونەوە. دۆزرانەوە و دەرکەوتنەوەی سەر لەنوێی دەقە کلاسیکە کۆنەکان، وای لە ئەوروپییەکان کرد کە بە روانگەیەکی تازەوە لە رووداوەکانی رابردوو و ئێستای خۆیان بروانن. لە روانگەی نوێدا ئیتر درێژەی کێشەی دێرینی نێوان ئیسلام و مەسیحییەت نەدەبینرا” دژایەتییەکی کۆنتر سەری هەڵدابوو، لەسەر بنەمای بەرگریکردن لە ئەوروپای ئازاد لە بەرامبەر سوڵتانە ستەمکارەکانی ئاسیا و هێزە بەربەرییەکانیاندا. سەرەرِای ئەمەش، ئەم یەکسانییە نەگونجاوە تا سەردەمانێکی دواتر کاری کردە سەر ئەوروپییەکان لە رووداوەکانی سەرزەوییەکانی رۆژهەڵاتی دەریای نێوەرِاست.

مەترسییەکی جیددی لەلایان ئەفریقیاوە بە بەراورد لەگەڵ ئاسیا، لەئارادا نەبوو. بەڵام لێرەشدا واتایەکی نوێی وەرگیراو لە دەقە کۆنەکان، بە زاراوە کۆنەکە دەدرا.

دۆزینەوەی تەریبەکان _ لەسەر دەستی لێکۆڵەرەوان لە بارەی سەردەمی کۆن، گەرِۆکەکان لە شۆینە جۆراوجۆرەکانی جیهان و ئۆمانیستەکان لە بارەی زماندا _ هاوکات لەگەڵ دابەزینی ئاستی کارتێکەریی کاربەدەستانی ئایینی لە بیروِرای ئەوروپییەکاندا، روانگەیەکی نوێی دروستکرد کە لەودا ئایین ئیتر نەك تەنیا تاقە ناسێنەر، بەڵکو تەنانەت ناسێنەری سەرەکیی ناسنامە، ورە و پێناسەی ناسنامەش نەبوو. گەشەکردنی زانست و پێکهاتنی پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا و کەلتوورە جۆراوجۆرەکاندا و رەنگە لەهەمووی گرینگتر، دەریاوانی





بەچواردەوری دنیادا و دۆزینەوەی دنیای نوێ بە شارستانیەتێکی کۆنی نەناسراو بۆ یۆنانییەکان و مەسیحییەکان وموسڵمانەکان، هەموویان بە یەکەوە پێوستیی پۆڵێنکردنی جوغرافیای جیهانی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرای هێنایە گۆڕێ و دۆزینەوەی کیشوەری چوارەم مانا و واتایەکی نوێ و تایبەتی بە کیشوەرەکانی تر بەخشی.

بەواتایەکی تر، دەرکەوتن و وەرگرتنی ئەمریکا ناسنامەی ئاسیا و ئەفریقیای پەسند کرد، چونکە ئەم دوو چەمکەش ئەوروپی بوون. دۆزینەوەی ئەمریکا وەك گرینکترین بەشی دۆزینەوەکانی ئەوروپییەکان، سەرکەوتنی ئەوانی بەسەر نەیارەکانی و بەتایبەتی موسڵمانەکاندا مسۆگەر کرد و لە ئاکامدا چەمك و واتا و پۆلێنکردنە ئەوروپییەکانی بە جیهانی کرد. دوای نەختێك بەدواداچوونی سەرەتایی، هۆگریی موسوڵمانەکان بە "دنیای نوێ" بە بەرپرسیارێتیی خۆیانەوە (چوونکە چەمکی ئەمریکا بە دەگمەن کەڵکی لێوەردەگیرا) کەم بۆوە. گرنیگترین بەڵگە ئەو نەخشەیە بوو کە دەریاوان و نەخشە هەڵگری تورك "پیری ڕییس" لە ساڵی ١٥١٣دا ئامادەی کرد. ئەو نەخشەیە زانیارە ونبووەکانی کریستۆف کۆلۆمبی لە خۆ دەگرت و لە ڕواڵەتدا کۆیلەیەکی ئیسپانی زانیارییەکانی بەم تورکە دابوو. "پیری" لە ساڵی ١٥١٧دا، لە قاهیرە، ئەم نەخشەیەی بەسولتان سەلیمی یەکەم _ داگیر کەری میسر _ دابوو. ئەم بەڵگەیە لە مۆزەخانەی "تووپکاپی" لە ئەستەنبوڵدا دانرابوو و فەرامۆش کرابوو، تا ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٢٩دا سەرنجی لێکۆڵەرێکی ئەڵمانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا[٧].

بە درێژایی چەندەها ساڵ تەنیا یەك کتێب لە لایان موسڵمانێکەوە لە بارەی ئەمریکاوە نوسرابوو، کتیبێك بوو بە ناوی مێژووی هیندی ڕۆژئاوا، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەمدا نووسرابوو، لە ساڵی ١٧٩٢دا لە یەکەمین چاپخانەی عوسمانییەکان دا لە چاپ درابوو. نووسەری نەناسراوی کتێبەکە



تارادەیەك ئاماژەی بە وردەکارییەکانی دۆزینەوە و داگیر کردنی " دنیای نوێ" کردبوو و باسی لە رووەك و گیانلەبەر و دانیشتووانەکەی کردبوو. ناوبراو ئاوات بۆ ئەوە دەخوازێ کە ئەم سەرزەمینە بەپیت و بەرکەتە بە نووری ڕێنوێنییەکانی ئیسلام رووناك بێتەوە و بێتە ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆریی عوسمانی[٨] .

لە سەدەکانی هەڤدە و هەژدەدا نووسراوە عەرەبی و تورکییەکان زانیارییەکی کەمیان لە بارەی داگیرکراوەکانی وڵاتانی ئەوروپی لە ئەمریکادا تێدا دەبینرێ. لە کتێبێکی تورکی دیکەدا لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا، ژنانی دانیشتووی ئەمریکا بە ژنانێکی ڕێك و پێك و وێنەکراو پێناسە دەکا. قەشەیەکی مەسیحیی کەلدانی کە خەڵکی مۆسل بووە، لە نێوان ساڵەکانی ١٦٧٥هەتا ١٦٨٣ سەفەرێکی بۆ بەشی ئیسپانیایی ئەمریکا کردووە و ڕاپۆرتی سەفەرەکەی خۆی بە زمانی عەرەبی نوسیووە[٩].

ئەوە روون نییە کە بە تێپەڕبوونی چ پرۆسەیەك و لە چ سەردەمێکدا نەوەکانی ئازتەکەکان و ئینکایەکان خۆیان بە ناوی ئەمریکی ناسیوە. پرۆسەیەکی لەم شێوە دەکرێ لە ئەفریقیا و ئاسیاشدا ببینرێ. ئەم پرۆسەیە بە دەستپێکی دەسەڵات یان لانیکەم کارتێکەریی ئەوروپییەکان دەستیپێکرد، ئەوکاتە کە ئاسیایی و ئەفریقییەکان ئەو زمانانەی کە پێشتر بە هۆی بەستنەوەیان بە کافرەکان بە سووك و چرووکیان دەزانین، فێربوون و دەستیان بە فێربوونی جوغرافیا لە دەقە ئەوروپییەکاندا. لە سەرتای سەدەی نۆزدە دا تورکەکان کە سەدان ساڵ لە هێڵی پێشەوەی بەرەی شەڕی موسڵمانەکان لە گەڵ مەسیحییەکان دابوون، ئەوکاتیش سەرزەوییەکانی هەڵکەوتووی سنوورەکانی رۆژئاوای خۆیان بە ئەوروپا ناو نەدەبرد، بەڵکو ئەوانیان بە سەرزەوییەکانی فرانکەکان، کافرەکان یان مەسیحییەکان ناودەبرد. لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، وردە وردە کەڵك وەرگرتن لە دابەشکردنی کیشوەرەکان و ناودانان بە پێی ئەم پۆلینە، دەستیپێکرد. زاراوەی ئەوروپا بە ڕێنوسی "اروفا" بۆ





ماوەیەکی کەم لە یەکەمین کتێبە جوگرافییەکانی عەرەبیدا دەرکەوتووە و پاشان ونبووە و لە بیرکراوە. بەڵام لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەمجارە بە رێنووسی عەرەبی "اروبا"، بە فارسی"اروپا"و بە تورکی" اوروپا" بە شێوەیەکی گشتی کەڵکی لێ وەردەگیرا. ئەو وڵاتانەی کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە ژێر نفووزی ئەوروپا دابوون، وەك وڵاتەکانی باکووری ئەفریقیا کە هی فەرەنسا، هیندوستان هی بەریتانیا، هیندی رۆژهەڵات هی هۆڵەندا و ئاسیای نێوەڕاست هی رووسیا بوون، کاریگەریی زانست و پەروەردەییە جوگرافییەکانی ئەوروپی، راستەوخۆ خێراتر بوو.

وەرگرتنی نموونەی ئەوروپی، بەشێوەیەکی سروشتی بووە هۆی بەرەسمی ناسرانی ئاسیا و ئەفریقیا، هەرچەندە ئەم دوو کیشوەرە بۆ ماوەیەکی زۆر بە هاوشانی ئەوروپا لە بەرچاو نەگیران. چەمکی ئاسیا گەرایی(*) لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتە ئاراوە و لە سەدەی بیستەمدا بوو بە جووڵانەوەیەکی دژە رۆژئاوایی و دژە ئیمپریالیستی. ماوەیەکیش، لە رواڵەتدا بە رەزایەتی هەر دوولا، ئاسیا وڵاتە ئیسلامییەکانی باشووری رۆژئاوای لەخۆ نەدەگرت. بیری پێکهێنانی ناسنامەیەکی هاوبەشی ئەفریقیایی کە هەموو وڵاتانی ئەفریقیا لە کەنارەکانی مەدیتەرانەوە تاکو کلکەی "گوود هۆپ" و هەموو زمان و کەلتوور و نەتەوە و ئایینەکانی کیشوەرەکە لە خۆبگرێ، تارادەیەك نوێترە و لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی ئەوروپا لەو کیشوەرەدا خرایە ڕوو. ئەگەر بزووتنەوەی ئەفریقیاگەرایی بەردەوام بێ، وەها بزووتنەوەگەلێکی دژی ئەوروپا تەوەری دوایین سەرکەوتنی خۆی لە ئەفریقیا دا تاقیدەکاتەوە.

دۆزەرە زەریاپێوە ئەوروپییەکان بە سەفەر بۆ چوار دەوری ئەفریقیا و ئەوروپا و ئەوبەری زەریایی ئەتڵەس تاکو کەنارەکانی ئەمریکا و بە پێکهێنانی

(*) Asianism.



پێوەندیی نێوان هەموو کیشوەرەکان و پێکهێنانی بواری گۆڕینەوەی شت ومەکەکان، دانەوێڵە و رووەك و ئاژەڵەکان و زانستەکان و بیروڕاکان، بۆ یەکەمجار لە مێژوودا کیشوەرەکانیان بۆ جۆرێك لە یەکیەتیی نزیککردنەوە.

ئەو بابەتە خۆی لە خۆیدا لایەنی نیگەتیڤیشی هەیە. هێڵەکانی پێوەندیی نێوان کیشوەرەکان، نەخۆشییەکانی نیوەگۆی رۆژهەڵات و رۆژئاوای بۆ یەکتر گواستەوە" بە جۆرێك کە هێندێك جار دەبووە هۆی پێکهێنانی نەخۆشییەکی نوێی ماڵوێرانکەر، پێویستی بە دۆزینەوە و دەوایەکی نوێ دەبوو. ئەم بارودۆخە نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانیشی لە خۆ دەگرت، بە شێوەیەك کە جۆرێکی تازە لە کۆیلەداری لە جیهان برەوی پەیدا کرد.

ئەوروپییەکان گەرچی لە سەدەکانی نێوەڕاستدا کۆیلەدارییان دەناسی، بەڵام گرینگیی کۆیلەداری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئەواندا زۆر کەمتر لە گرینگی و پێگەی کۆیلەداری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئەمریکییەکانی بەر لە کریستۆف کۆلۆمب و ئەفریقیای موسڵمان و غەیرە موسڵمان بوو. پێکدادانی کەلتوورە جۆراوجۆرەکان جۆرێکی نوێی لە کۆیلەداریی کۆلۆنیالیستی دروستکرد. سەرزەمینە بەپیتەکانی ئەمریکا هەل و بوار و ململانێی لە یەك کاتدا رەخساندبوو. ئەوروپییەکان بە پشت بەستن بە هێزی داهێنەرانەی خۆیان وێڕای تەماح، دوای فێربوونی کشت وکاڵ و کۆیلەداری لە وڵاتانی ئیسلامی و ئەفریقیایی، توانیان بە باشی کەڵك لەو هەلە وەربگرن. کۆیلەداریی کۆلۆنیالیستی و بازرگانیی دەریایی کۆیلە بوو بە هۆکارێکی سەرکی لە ئاڵ و گۆڕی چەند لایەنەی نێوان چوار کەناری سەرەکیی زەریای ئەتڵەس - ئەوروپا، ئەفریقیا، ئەمریکای باکوور و ئەمریکای باشوور.

بەڵام ئەوە دیسانیش ئەوروپا بوو کە یەکەمجار بڕیاری ئازادکردنی کۆیلەکانی دەرکرد، سەرەتا لە وڵاتەکانی خۆی، پاشان لە وڵاتە داگیرکراوەکانی خۆی و لەئاکامدا لە شوێنەکانی تری جیهانیشدا. پێشکەوتن و تەکنەلۆژیای رۆژئاوا





پێویستی بە کۆیلەداری نەبوو، ڕای گشتی ڕۆژئاواش قبووڵی کۆیلەداری نەکرد. سیستەمی کۆیلەدارییی زۆر و جۆراوجۆر لە دنیادا بوونی هەبووە، بەڵام تەنیا بۆ یەك جار ریشە و لق و پۆپەکانی لەدنیادا پەلکێشکراوە.

دۆزینەوەی ئەمریکا، باش یان خراپ، بەخاڵی وەرچەرخان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەژمێردرێ و ڕۆڵێکی گرینگی لە گواستنەوەی مۆدێرنیتەدا گێڕاوە، کە لە ئەورووپاوە دەستیپێکرد و لە ڕێگای دۆزینەوەکان و داگیرکارییەکان و گرتنەکان و پڕوپاگەندەچی و پەنابەرانەوە گەیشتە هەموو جیهان. دۆزینەوەی ئەمریکا زۆر زیاتر لە ڕووداوی هاوسەردەمی خۆی واتا گرتنی غەرناتە، سەرکەوتنی ئەورووپای بە سەر دوژمنەکانیدا مسۆگەر کرد. ئەورووپا بە داهاتی کانەکانی زێڕ و زیوی دنیای نوێ، نرخی شەڕەکان و بازرگانی و داهێنانەکانی خۆی دابینەدکرد. زەوی و زارەکانی ئەمریکا سەرچاوە و بەرهەمی نوێیان دابینکردن و ئەو هێزەی بە ئەورووپییەکان بەخشی کە بۆ یەکەمجار لەگەڵ موسڵمانان و ئەوانیتر، سەرەتا وەك هاوتا و پاشان وەك لایەنی بەهێزتر، بازرگانی بکەن. ئاشنابوون، چیوارچێوە فکرییەکانی تێکشکاند و بیر و زەین و ڕۆحی مرۆڤەکانی ئازاد کرد. ڕەنگە بکرێ بە شێوەیەکی مەجازی بگوترێ کە کریستۆف کۆلۆمب هەم بەدوای مەسیحییەکان و هەم بە دوای بەهارات و هەم بە دوای یوحنای قەشەدا بووە و ڕەنگە بکرێ بە شێوەیەکی سونبولی ئەوەش زیاد بکرێ کە ناوبراو بە هەمووی ئەوانە و تەنانەت زیاتریش، گەیشت. کەوایە بۆچی ئەورووپییەکان لە ڕێگای شەڕ و داگیرکاری و پەرەپێدانی ئایینی خۆیان دەستیان بە دروستکردنی دنیایەکی ئەورووپا سەنتەرانە کرد؟ ئایا بە هەمان شێوەیە کە هێندێك پێیان وایە کە ئەم کارە بە هۆی گلاوییەکی ریشەدار یان بۆماوەیی، یان لاوازیی ڕەوشتییەوە بووە؟ ناکرێ وەڵامێك بەو پرسیارە بدرێتەوە چونکە بە شێوەیەکی نادروست خراوەتە ڕوو. لە داگیرکاری و تالانکردنی نەتەوەکانی تردا، ئەورووپییەکان هەر ئەو کارەیان دەکرد کە



هاوسێکان و پێشینەکانی خۆیان دەیانکرد، کارێك کە لەراستیدا لە کۆمەڵگای مرۆییدا نەریتێکی باو بووە. بەتایبەتی هێرشی ئەوان بۆ سەر هاوسێ موسڵمانەکانیان لە ئەفریقیا و ئاسیادا کردەیەکی بەرانبەرانە بووە. مەسەلەکە ئەوەیە کە بۆچی دوای سەرکەوتن، ئەوەیان بە گوناه زانی و هەستیان بە پەشیمانبوونەوە کرد.

هەوڵەکانی ئەوان لە بەر ئەوە بووە کە ئەوانیش مرۆڤ بوون و سەرکەوتنەکانیان لە سەرچاوەیەك ئاوی دەخواردەوە کە ریشەیان لە زاتی شارستانیەتی ئەورووپا و کورەکانی دابوو. بێگومان ئەورووپا هەموو تایبەتمەندییە پێویستەکانی بە ئیمپریالیزم بوونی وەك مەیلی داگیرکاری، توندوتیژی، خۆخوازی و هەست بە بەرپرسایەتیکردن لەبەرانبەر باب و باپیرانیاندا، تێدابوو. بەڵام ئەوان شتێکی تریشان هەبوو کە هەم داگیرکارانی پێشوو و هەم ئەوانەی کە داگیر کران و پاشان رزگار بوون، تاقیکردنەوەکەیان ڕەنگە بە باش دەزانی. هەندێك لە ڕەخنەگران دۆزینەوەکەی کریستۆف کۆلۆمب بە پێی مێژووی وڵاتی ئەمریکا هەڵدەسەنگێنن نەك بە پێی کیشوەری ئەمریکا، چوونکە کریستۆف کۆلۆمب بە بەرپرسی نەهایی ئەو کارە دەزانن. لە سەدەی بیستەمدا گۆڕانکاریی گرینك لە شارستانیەتی ئەورووپادا ڕوویدا. رووسیا وێڕای ئەو سەرکردانەی کە دوژمنایەتییەکی قووڵیان لەگەڵ بەهاکانی ئەورووپیدا هەبوو لە ئەورووپا دوورکەوتنەوە و دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیشیان ناچار بە پەیڕەوی لەم سیاسەتە کرد. ئەوان ئێستا کە بە تەحموولی گرفت و دژوارییەکی زۆرەوە هەوڵدەدەن بگەڕێنەوە. ئەورووپای ڕۆژئاوا، لاواز و ماندوو لە دوو شەڕی ماڵوێرانکەر، لەحاڵێکدا کە ئیمپیراتۆریی خۆیان لەدەستداوە، خۆیان بە دەستی شارستانیەتی نوێی ئەمریکا دەسپێرن، شارستانیەتێك کە لە بنەما و زۆر بەهای تردا ئەورووپییە، هەرچەندە کە لە زۆر بەهای تردا جیاوازن. بەڵام ئێستا ئەوە بۆتە باو، کە ئێمە ئەو





شارستانیەتە کە لەودا ئەوروپا بە سەرچاوە و ئەمریکا بەسەرکردە دەژمێردرێ، بە "رۆژئاوا"ی ناوبەرین. ئەو ناوە جگە لە مانای روونی جوغرافی، دوو واتای تاڕادەیەك هاوبەش و جیاوازی هەیە. یەکێك بە مانای هاوپەیمانییەکی عەسکەری بە دژی سۆڤیەتی پێشوو بوو. ئەو هاوپەیمانییە زۆر وڵاتی ئەوتۆی لە خۆ دەگرت کە هیچ کام لە بەها سەرەکییەکانی رۆژئاوایان تێدا نەبوو بەڵام وەك پێویستییەك، پێویستییە ستراتژییەکانی ئەو هاوپەیمانەتیەیان پاراست. مانای تر ئەوە بوو کە ئاماژەی بەو گەلانە دەکرد کە لە بەهای روونی وەك ئازادی، گەورەیی و رێز و پاراستنی مافی مرۆڤدا هاوبەش بوون بەڵام حەزیان لە بەشداری لە هاوپەیمانێتیی دژە سۆڤیەتیدا نەبوو. ئەمرۆکە دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت و کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، رەنگە ئەوروپایەکی نوێ و گەورەتر و رەنگە بەهێزتر دەرکەوێ، ئێستاکە رۆژئاوا پێویستییەکی زۆری بە چەك و تەقەمەنی نییە، ئاواتی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گەورەتریان لە مێشك دایە. بەڵام ئێستا لەو حاڵەدا، تەماح و خۆخوازی لە نێو ئەوروپییەکان و کوڕان و قوتابییەکانیدا، بەتایبیەتی لە ئەمریکای باکوور، شوێنی خۆیان بە هەستی تێری و گوناە و گومان بەخشیوە.

گومان شتێکی باشە، لەڕاستیدا بە یەکێك لە بنەماکانی بەرزبوونەوەی ئاستی شارستانیەتی رۆژئاوادەژمێردرێ.گومان دڵنیایی لە نێو دەبا. "دڵنیایی" لە شارستانیەتەکانی تردا و لە قۆناغەکانی سەرەتایی شارستانیەتی ئێمەدا بیروبۆچوونە وێرانەکان و دان بەخۆداگرتنی لاواز، پێشگیری لە دەرکەوتنی هاوکاریی نێوان نەیارەکان کە بە دێمۆکراسی ناودەبرێ، دەکرد. گومان بە پرسیار و وەڵام و دۆزینەوە و سەرکەوتن و زانیاری نوێ _ بۆ وێنە ناسینی شارستانیەتەکانی تر_ کۆتایی دێ. هەستکردن بە تاوانباربوون لە واتای نوێدا _ واتە لەزەیندا نەك لە بڕیارێکی شەرعیدا _ رووخێنەرە. ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتیی هەموو گەندەڵییەکانی جیهان، دوانەی نوێی



"هەستی بەرپرسایەتی مرۆڤی سپی پێست" وە هەر ئەوەندە خۆهەڵکێشانی خۆمان و خوبەزلزانی خۆمان لە بەرامبەر ئەوانیتردا لەو رستەیەدا خۆی حەشارداوە، کە لەو بانگەشە بێ بنەمایەی باب و باپیرانی داگیرکەری ئێمەدا خۆی حەشارداوە کە دەڵێ ئەوروپا سەرچاوەی هەموو چاکییەکانە.

دەستەواژەی " فرەچەشنیی کەلتووری"(*) کە ئەمرۆکە دنیای داگرتووە بەو مانایەیە کە راهێنان و کەلتووری ئەوروپاسەنتەرانە دەبێ بە شێوەیەك بە پێی فرەچەشنیی کەلتووری گۆڕانی بە سەردابێ. فرەچەشنیی کەلتووری خۆی لەخۆیدا شتێکی باش و گونجاوە لەگەڵ نەریتەکانی ئەوروپا و رۆژئاوا. چونکە ئەوە رۆژئاوا بوو کە بۆ یەکەم جار خوێندنەوە و لێکولینەوەی لە بارەی کەلتوورەکانی بێگانەی بە وردی و هۆگری و رێزەوە دەستپێکرد و شارستانیەتە مردووەکانی لە ژێر خاك دەرهێنایەوە و نوسراوە لەبیرچۆوەکانی زیندوو کردەوە و هەنگاوێکی گەورەی لە پێناوی ناساندنی ئەواندا هەڵێنایەوە.

شارستانیەتی ئەوروپا بە هیچ شێوەیەك بە تەواوەتی ئەوروپی نییە، بەڵکو وەك هەموو شارستانیەتە ناسراوەکانی تر لە مێژوودا، لە ژێر کاریگەریی شارستانیەتەکانی پێشوودا، بە تایبەتی شارستانیەتی میسر و"بين النهرين"، دەوڵەمەند بووە. خوێندنەوەی شارستانیەتەکانی تر، سەرەڕای گرینگیی زاتیی ئەوان، یارمەتیمان دەدات تاکو تێگەیشتنێکی قووڵ و واقعیان لە خۆمان هەبێ. رەنگە ئەوە دروستنەبێ لەحاڵێکدا کە خوێندکارانی ئێمە هیچ جۆرە هۆگرییەکیان بۆ فێربوونی زمانەکانی وڵاتانی هاوسێیان نییە، تەنانەت گرفتیان لەگەڵ فێربوونی زمانی وڵاتەکەی خۆشیاندا هەیە، داوایان لێبکەین کە زمانەکانی بێگانە و زمانە کۆنەکان فێربن. بەڵام من وەك عەرەبناسێك دەبێ بڵێم کە زمانی عەرەبی یەکێك لە زمانە کلاسیکە گەورەکانی شارستانیەتی

---

(*) multiculturalism.





مرۆڤە کە بە هەڵگری کەلتوورێکی زانستی و فەلسەفی و ئاینیی و ئەدەبیی دەوڵەمەند دەژمێردرێ.

بەڵام ئەگەر "فرەچەشنیی کەلتووری" خۆیندنەوەیەکی دەستکرد و ئایدیالی لە کەلتوورەکانی تر بخاتە ڕوو و ئەوان لە بەرانبەر کەلتووری سووک کراوی رۆژئاوا دابنێ، مەترسیدار دەبێ. بە دڵنیاییەوە، کەلتووری ڕۆژئاوا کەموکورتی هەیە. بەشێك لەم کەموکورتییانە پەیوەندیان بە هەموو مرۆڤایەتی و بەشێکیان پەوەندیان بە خۆیانەوە هەیە. لەبارەی زۆر لەو تاوانانەی کە دەخرێنە پاڵ ڕۆژئاواوە، چارەیەکی جگە لە داننان بە تاوانی خۆمان نییە. ئێمە ڕۆژئاواییەکان بە هۆی هێرش و کوشتار و تاڵان و داگیرکردن و گرتنی کۆیلە و خۆبەزلزانی بەرانبەر بە نەتەوە و کەلتوورەکانی تر، تاوانبارین. بەڵام بۆ دڵدانەوەی خۆمان دەبێ بڵێین کە ئێمە لەمێژساڵە ئەو کارانەمان بە ڕەوا زانیوە و تەنانەت بەر لەمەش، ئەم کارانەمان بە ڕەزای خوا و بە حوکمی شەریعەتی خوا داناوە.

دنیای نوێ کە مێژووە نوێیەکەی لە ساڵی ١٤٩٢ دا دەستیپێکردووە، لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمەوە بووە بە سەرکردەی بێ هاوتای شارستانیەتی ڕۆژئاوا و بەرگریکاری پرەنسیپەکانی ئەو شارستانیەتە لە بەرانبەر دوژمنە نێوخۆیی و دەرەکییەکاندا. ئەگەرچی ئەمڕۆکە هێندێك کەس ڕەخنە لە سەرکردایەتی ئەمریکا دەگرن و هێندێکیش ڕەتیدەکەنەوە، بەڵام لەڕاستیدا رکابەرێکی جیددی و هەڵبژاردەیەکی سەرکەوتوو لە بەرانبەریدا نییە. تەنانەت ئەوانەی کە هەموو ڕۆژێك دروشمی مردن بۆ ئەمریکا دەڵێنەوە، توانای دەستبەرکردنی ئاواتەکەیان نییە. ڕەنگە تەنیا لە ڕێگای هاریکاریکردنی ڕەوتە ئینتحارییەکان لە نێو کۆمەڵگای ئەمریکیدا بە ئامانجەکەیان بگەن. لەم حاڵەتەدا نەك ئەوان بەڵکو ئەوانیتر داوای میرات دەکەن.



بەڵام ئەو میراتە چییە و ئایا بەهای پاراستن و داواکردنی هەیە؟ هەموو کەلتوورەکان بە دەستکەوتەکانی خۆیان - مۆسیقا، فەلسەفە، زانست و ئەدەبیات و شێوازی ژیان و هونەرەکانی تر - خزمەتیان بە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی کردووە و بێگومان ناسینی ئەو دەسکەوتانە خزمەت بە دەوڵەمەندبوونی هەموولایەکمان دەکا. دیاریکردنی جۆراوجۆریی بێ کۆتایی ئادەمیزاد و تێگەیشتن لە پێویستی خوێندنەوە و فێربوون، بە یەکێك لە باڵاترین داهێنانەکانی ڕۆژئاوا دەژمێردرێ. چوونکە ئەوە تەنیا ڕۆژئاوا بوو کە ڕێز و بەهای بۆ لێوردبوونەوە لەبارەی کەلتوورەکانی تر و مەیلداری بۆ فێربوونی زمانەکانی دیکە و خوێندنەوە و بەدواداچوونی داب و نەریت و دەسکەوتەکانی گەلانی تر داناوە. شارستانیەتە ناسراوەکانی مێژوو _ بەبێ ڕیزپەڕ _ خۆیان بە رەها زانیوە و ئەوانیتریان بە ژێرکۆمەڵەی شارستانیەتی خۆیان سووك کردووە و ئەوانیان بە بەربەر و کافر و پیس و گوڵاو و بووتپەرست و شەیتانی دەرەکی و مایەی شەرمەزاریی مرۆڤایەتی ناوبردووە. ئەوان تەنیا لە ژێر گوشاری زاڵبوونی دەرەکیدا هەوڵیانداوە فێری زمانی شارستانیەتەکانی تر بن و تەنیا بۆ بەرگری لە خۆیان هەوڵیانداوە لە بیروبۆچوون و ڕێ وشوێنی پاشاکانی سەردەمی خۆیان تێبگەن. بە واتایەکی تر، ئەوان لە دەسەڵاتدارانی خۆیان فێر دەبوون، لەو کەسانەی کە ناچار بوون بە ئاغا و مامۆستای خۆیانی بزانن. تێکەڵاوییەکی تایبەتی لە وردبوونەوەی بێ سنوور بەرانبەر بە ئەوانیتر و ریزی سەربەستانە بۆ "ئەویتر بوون" ی ئەوان، لایەنێکی ڕوونی لە کەلتوورەکانی ڕۆژئاوا و بە ڕۆژئاواییبووندا دروستکرد کە ئێستاش کەسانێك کە نە بەشێکیان لەودا هەیە و نە لێی تێدەگەن، بە تووڕەیی و سەرسووڕمانەوە لێی دەڕوانن.

بە شایەدی پێشینەی ناخۆشی ئێمە لە شەڕەکان و سەرکوتکردنەکاندا، ئێمە ڕۆژئاواییەکان بە شێوەیەکی دڵتەزێن نەمانتوانیوە ڕێز بۆ ئەو کەسانە دابنێن





که جیاوازییان له گەڵ ئێمەدا هەیە. بەڵام ئەوە شتێکە کە لانیکەم بە هۆیەوە وەك ئایدیای خۆمان، هەوڵمانداوە و تارادەیەکیش توانیومانە کە بە ڕێوەی بەرین و بۆ کەسانی تریش بیگوازینەوە. ئەوە واتادارە کە لە کۆتایی شەڕی ڤێتنامدا، ژمارەیەکی زۆر ڤێتنامی بۆ دورگەی هۆنگ کۆنگ ڕایان کرد، بۆ تەنیا شوێنێك کە لە ئاسیای ڕۆژهەلاتدا دەوڵەتێکی ڕۆژئاوایی حوکمی دەکرد" چوونکە لەوێ دەیانتوانی هیوایەکی هەرچەند کەمیش بێ، بە سەرنج و هاوکاری دەوڵەت هەبێ.

ئیمپڕیالیزم و سێکسڤالیتە و ڕەگەزپەرستی چەمکی دەستکردی ڕۆژئاوان" ئەویش نەك بەو هۆیە کە ڕۆژئاوا ئەم گەندەڵییانەی دروستکردبێ بەڵکو بە هۆی ئەوەی کە ڕۆژئاوا ئەوانەی ناسی و دەستنیشانی کردن و ناوی لە سەر دانان، پاشان پرۆتستۆی کردن و بە هەموو هێزەوە دژیان تێکۆشا و لەگەڵیاندا شەڕی کرد" شەڕێك کە بێهوودە نەبوو بەڵکو ئەوانەی لاواز کرد و بە ڕزگاربوونی قوربانیانی ئەو دیاردانە کۆتایی هات. ئەگەر شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە نێوبچێ، ئەو گەندەڵییانە لە نێو ناچن. خەسارەتی چاوەڕوانکراو بریتی دەبن لەئازادیی پرۆتستۆکردنیان و هەوڵدان بۆ کۆتایی پێهێنانیان.

بەڵام دوور نییە کە شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە نێو بچێ. بێ باوەڕیی ئەو کەسانەی کە دەبێ بەرگری لەو شارستانیەتە بکەن و شەوقی شێتانەی ئەو کەسانەی کە ئەم شارستانیەتە تاوانبار دەکەن، ڕەنگە دەست وەدەستی یەك بدەن و لە نێوی بەرن. بەڵام ئەگەر شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە نێو بچێ، ژن و پیاوی هەموو کیشوەرەکان لە بەرانبەر مەترسیی برسیەتی و هەژاریدا قەرار دەگرن.

## پەراوێزەکان

### بەشی یەکەم

١- نووسراوەی زۆر لەبارەی روانینی سەدەکانی نێوەڕاستی ئەوروپا بە ئیسلام و موسڵمانەکان ماوەتەوە کە دەکرێ بۆ وێنە ئاماژە بەو سەرچاوانەی خوارەوە بکرێ:

R.w.southern,Western Views of islam in the Middle Ages (cambridge, Mass,1962); Aldobranino Malvezzi, L'Islamismo e la cultura europea (Florence, 1956); Norman Danael. Islam and the West: The Making of an Amage (Edanburgh, 1960; Ekkehatt Roter, Abendland und Sarazenen (Berlin, 1986); and Kenneth M.Setton, Western hosility to Islam and Prophecies of Turkish Doom (philadelphia, 1992).

لەبارەی روانینی موسڵمانانی بەر لە سەردەمی مۆدێرن بۆ ئەوروپا، بڕواننە:

A.A. Vasiliev, Byzance et les Arabes Revised and Expanded By H.Gregoire, M.Canard, and M.Nallino, 3 Vols. (Brussels, 1935_1968), including translations and discussions of arabic texts; and ahmad shboul; Almasudi and his word: A muslim humanist and his interest in Non_ muslim (london 1979),

کە زانیاریی مێژوونووسانی عەرەب لە بارەی ئیمپڕاتۆری بێزەنتی لە خۆدەگرێ. لە بارەی پێوەندییەکان لە سەردەمی شەڕە سەلیبیەکاندا بڕواننە:

Benjamin Z. kedar, Crusade and Mission: European Approshes Toward the Muslims (princeton, 1984); claude cahen, Orient et Occident au



tempsdes Croisades ( Paris, 1993); Amin Maalouf, the Crusades Through Arab Eyes (London, 1984); and Emmanuel Sivan, L, Islam et la Croisade: Idiologie et propagande dam les reactoins Musuimanes aux croisades (Paris, 1968) .

لەبارەی ئەو شتانەی کە موسڵمانەکان لەسەر ئەوروپا دەیانزانن و بیریان دەکردەوە، بڕوانە کتێبی بێرنارد لوییس: "یەکەمین موسڵمانەکان لە ئەوروپا".

٢- بۆ زانیاری لەبارەی زانستی موسڵمانان لە سەردەمی کۆندا ئەم سەرچاوانە بخوێنەوە:

Franz Rosenthal, Das fortleben der Antike im Islam (Zurich, 1965), English translation, Clashcal Heritage in Islam (Berkeley, 1975).

٣- بۆ خوێندنەوەی هەڵکردن و لێبوردن لە نێو موسوڵمانەکاندا سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:

Rudh paret, "Toleranz und Intoleranz im Islam, "Saeculm 21 (1979): 344-365; Francesco Gabrieli, "La tolleranza nell' Islam, "La cultura 10 (1972):257-266, reprinted in Gabrieli, Arabeschi estudi islamici (Naples, 1973), pp. 25-36; Adel Khoury, Tolerans im islam (Munich, 1980); and Bernard Lewis, The Jews of Islam (Princeton, 1984), pp. 3-66.

4- Rashid al-Din, Histoire des Francs, ed. And trans. K.Jahn (Leiden, 1951), text P. II, translation P.24.

5- Jacgues-Paul Migne, ed., Patrologiae cursus complletus, series, vol. 126, col. 816, guoted in Marius Canard, "La Guerre sainte dans le monde chretien, "revue africain (algers) (1936): 605-623. see also anouar hatem,les poesies eqpiques des croisades (paris, 1932), pp. 36-40.

بۆ لێکۆڵینەوەی جیاوازیی تێڕوانینی موسڵمانەکان و مەسیحییەکان لە بارەی شەڕە ئایینییەکان و شەهادەت، بڕواننە :





Albrecht Noth,heiliger krieg und heiliger kampf in islam und christentum:beitriige zur vorgeschichte der kreuzzuge (bonn, 1966).

٦- لەو بارەوە بگەڕێنەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە:

David Ayalon,gunpowder and fireams in the mamluk kingdom: A challenge to a medieval society(london, 1956, 1978).

بۆ لێکوڵێنەوە لە بارەی مێژووی پێشکەوتنی دروستکردنی چەك لە دنیای ئیسلامدا بگەڕێنەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە:

EI2, s.v. ”barud”.

7- Quoted in ayalin, gunpower, pp. 94-95.

8- Selaniki mustafa efendi, tarihi setaniki, ed. mehmet ipsirli (istanbul, 1989), vol.1, p.334.

9- Charles issawi, ”technology,energy, and civilization:some hostorical observations,”international journal of middle eastern studies 23 (1991): 281-289.

10- karl jahn, “das iranische papiergeld,” archiv orientalni 10 (1938): 308-340.

١١. بۆ خوێندنەوە لە بارەی مێژووی چاپ لە دنیای ئیسلامدا:

El2,sv.”matba a”on early hebrew printing,see A.freimann,uber hebraische inkunabeln (leipzig,1902);and A.M.haberman, toldot ha-sefer ha-ivri (jerusalem,1945).

12- Kemal Ataturk, speech delivered at izmir,31 January 1923, in ataturkun soylev ve demecleri II (1906-1938) (ankara,1952), p.84.ataturk returned to his theme on other occasions,notably in a speech delivered at kastamonu on 30 August 1926 (ibid,p.219).



١٣- لەبارەی روانگەی موسڵمانان بۆ ژنانی رۆژئاوا و وێنەی ژنانی رۆژئاواییی لە ئەدەبیاتی نۆییی عەرەبدا:

Lewis,muslim discovery,pp.281,286-293.on the portrayi of the western woman in modern Arabic literature, see Rotraud Wielandt,das bild der europaer in der modernen arabischen erzahl und theaterliteratur (beirtut, 1980), especially pp.489-553; and wielandt , “factors determining the picture of the european woman in modern arabic fiction,” tarih: papers in near eastern studies 2 (1992): 17-40.

14- Bernard vincent, 1492: L Annee admirable(paris, 1991), pp. 72-78.

15- Ibil, p. 78.

16- A.Adnan [Adivar], La science vhez les turcs ottmans(paris,1939), p.57.

**بەشی دووهەم:**

1- paolo preto, venezia e i turchi (florence, 1975), p.13.

٢- بۆخوێندنەوە لە بارەی وێنەی پێغەمبەر لە چاخی نیوەڕاست و قوناغی نۆیی عەرەب:

EI2, sv."muhammad, "pt.3, where extensive bibliographical guidance is given. Among earlier litrature, reference must still be to the classical study by alessandro d Ancona,"La leggenda di maometto in Occident,"Giomale storico della letteratura italiana 13 (1899): 199-281.

مێژوونووسێکی فەرەنسی بە ناوی "ئادهومار چابانز" جوولەکەکان بۆ ئەم وێرانکارییانە بە تاوانبار دەزانێ. ناوبراو دەڵێ کە جوولەکەکانی رۆژئاوا بە ناردنی چەندین نامە بۆ رۆژهەڵات، مەسیحییەکان تاوانبار دەکەن و هۆشداریان پێدان کە ئەوان دەیانەوێ سوپایەك لە رۆژئاوا بۆ شەڕی ساراسنەکانی رۆژهەڵات بنێرن. چاو بەم سەرچاوەیەدا بخشێنن:

Adhemar of chabannes , chronican aquitanicum et francicum 137, cited in hatem,les polisies, p.43.The claim by A11an harris cutler and helen elmquist catler, the jew asAlly of the muslim: medieval roots of anti-semitimi (Notre Dame, 1986).

4- shlomo eidelberg, ed.and trans, the jews and the crusades:the hebrew chronicles of the first and second crusades (Madison, 1977), p.22.

5- Bernard lewis,"the pro-islamic jews,"judaism 17(1968):391-404,reprinted with revisions in lewis.islam in history,2nd ed.(chicago, 1993), pp. 137-151).

6- Johannes hofer, johannes kapistran: einleben im kampufum die reform der kirche (heidelberg, 1964)vol.2, p.155.Compare H.H.ben-sasson, ed , A history of the jewish people (Cambridge, mass, 1976), p.580.



7- On the noahid commandmants, see midrash rabba, naoh,34.8, english translation by H.freedman and maurice simon, the midrash rabbah : genesis (london,1977) ,vol.1,p.272.

٨- بابەتی زۆر لە بارەی ماڕانووەکان هەیە. لە بارەی چارەنووسی ئەوان لە ئیسپانیادا:

Antonio dominguez ortiz , los judeoconversos en espana y america (madrid,1978).

لەبارەی پاکیی خوێن لە ئیسپانیا:

Albert sicroff, les controverses des statuts de "purete de sang"en espagne du XV au XVII siede (paris,1960).

لەبارەی گۆڕینی ئایینی ماڕانووەکانی ئیبیری و چوونیان بۆ ئۆرشەلیم لە ئیمپراتۆریی عوسمانیدا:

Minna rozen, jewish identity and society in the seventheenth century:reflections on the life and work of refael mardekhai malki (tubingen,1992). On the practice of religious dissmulation by shi ite muslims,see EI1,sv."tkiya."

٩- ئەو وتاربێژییەی ڤێنزۆئێلا کە لە ساڵی ١٩٨٥دا بەڕێوەچوو، لە راستیدا جێژنی بۆ دەرکردنی جوولەکەکان ناگێڕێ، بەڵکو تەبەرێیان دەکا. هەروها داکۆکی لە یاسای ئەنگیزاسیۆن دەکا وەك کردەیەکی نەتەوەیی و بە بەڵایەکی کەمتری دەزانێ:

Jorge olavarria, conmemoracion del descubrimiento de america (caraces, 1985), especially pp.13, 16-18.

١٠- بۆ لێکۆڵێنەوەی زیاتر:

The sephardi heritage: essays on the history and cultural contribution of the jews of spain and portugal, vol.1:the jews in spain and portugal before and after the expulsion of 1492, ed.R.D.barnet(london, 1971);vol 2:the

western sephardin , ed.R.D.barnett and W.M.schwab (Grendon, Northants, 1989).

١١- بابەتێکی بەرچاوی تر پەیوەستە بە پزیشك و ئاییناسی گەورەی جوولەکە "ابن میمون" کە لە کوردۆا (قرطبة) لە دایکبووە و ساڵەکانی یەکەمی ژیانیشی هەر لەوێ بەسەر بردووە. بە پێی ئەو سەرچاوەیە، ناوبراو لە سەردەمی دەسەڵاتی توندڕەواندا ناچار بووە بە رواڵەت ئایینی ئیسلام قبوڵبکا، بەڵام لە هەلی یەکەمدا لەگەڵ خێزانەکەی هەڵهاتن بۆ میسر کە ژینگەیەکی ئازادتر بوو و لەوێ بوو بە سەرکردەی جوولەکەکانی قاهیرە. رۆژێك موسڵمانێکی مەراکیشی ناوبراوی لە قاهیرە دیت و ناسییەوە و گوتی چونکە "ابن میمون" لە پێشدا بۆتە موسڵمان و ئیستا هەڵگەڕاوەتەوە، حیسابی هەڵگەڕاوە و مورتەدی بۆ دەکرێ و دەبێ بە توندترین شێوە سزا بدرێ. بەڵام حاکمی میسر گوتی چونکە بوونە موسڵمانی ناوبراو بە زۆرەملێ بووە ناکرێ ناوبراو بە هەڵگەڕاوە لەقەڵەمبدەین . هەربۆیە ابن میمون ئازاد کرا و گەڕایەوە بۆ سەر ئایین و پیشەی خۆی. ئەم داستانە لێکۆڵەرێکی میسری لە سەدەی سێزدەهەم لە کتێبی خۆیدا نووسیویەتی:

Ibn al-qifti, tarikh al-hukama, ed.J.lippert (leipzig, 1903), pp.317-319.

12- Attilio milario, storia degli ebrei in italia(turin,1963), pp.250-252, where earlier sources and atudies are cited.

13- Eliyahu capsali, seder eliyah zut .a, ed. aryeh shmuelevitz (jerusalem, 1975), vol.1, pp. 218-219, and earlier, partial edition by M.lanes, de vita et scriptis elia kapsalii (padua,1869), pp.12-13. on capsali and his work, see moritz steinschnaider, die geschochtsliterature der juden (frankfurt,1905), pp.93-94.

لە سەرچاوەکانی جوولەکەدا نموونەی زۆر لە بارەی ڕێز و سپاسی جوولەکەکان بۆ ئیمپراتۆریی عوسمانی هەیە بە هۆی ئەوەی کە ناوبراو لە کاتی خۆیدا جێگا و پەنای بە جوولەکەکان داوە. وەکو نموونە دەتوانین ئاماژە بە نامە بەناوبانگەکەی (ئادرنە) بکەین، کە پێدەچێ لە



سەرەتاکانی سەدەی پازدەیەمدا نووسرابێ. واتە بەر لە دەرکردنی کۆتایی جوولەکەکان لە ئیسپانیا و لەوپەڕی ئازاردانیاندا. نووسەری ئەم نامەیە خۆی بە جوولەکەیەکی فەڕەنسایی بە رەگەز ئەڵمانی دەناسێنێ کە لە (ئادرنە) ژیاوە. ناوبراو بە ئاشکرا باس لە ئەشکەنجە و ئازاردانی ئەوروپاییەکان و نەرم و نیانی و دان بەخۆداگریی تورکەکان دەکا. دوای زیاتر لە یەك سەدە، جوولەکەیەکی پورتوگالی بە ناوی (ساموئێل ئاسکۆ) کتێبێکی بەناوبانگی بە ناوی (سوکناییەك بۆ رەنجەکانی ئیسرائیل) نووسی و تێیدا بە دوو سوکنایی خوایی و ئینسانی کرد بۆ هاوئایینەکانی و تورکیای وەك گەورەترین هاوەدردیکەری مرۆیی ناوبرد.

14- capsali,sedereliyah zut.a,vol.I,pp.7-15.

١٥- لەبارەی ئەم سەرچاوانەوە بڕواننە:

Bernardlawis,notes and documents from the turkish archives: A contribution to the history of the jews in the ottoman empire(jerusalm, 1952), pp.28-34,reprinted in lews,studies in classical and attoman islam(7th-16th centures) (london,1676); and ,on the cancellation of the previous orders, uriel heyad,ottoman documants on palestine, 1552-1615(oxford, 1960), pp167-168. on these and other similar orders for resettlement,see lewis, jews of islam , pp.121-125.

١٦- لەبارەی" ژمە" وە بڕواننە:

EI2s.v.where sources and studies are cited.

17. L.P.harvey, islamic spain, 1250-1500(chicago, 1990); and EI2, s.v.

18- Friez meierK, “uber die umschrittene pflicht des Muslims, bei nichtmuslimischer Besetiung seines landes auszuwandern,” Der Islam 68 (1991) :65-86; Bernard lewis, “ legal and Historical Reflectiolls on the Position of muslim Populations under non- muslim rule, “Journal of the institite of muslim minority affairs 13 (1992):1-16,reprinted in





ewis,islam and the west (new york ,1993),pp.43-57;and A.L.udovitch,"muslims and jews in the world of frederic II:boundaris and communication ,"princeton papers in near eastern studies 2(1993):83-104.

19- Abul-Abbas ahmad ibn yahya al-wansharisi,"asna al-matajir ti bayan ahkam man ghalaba ala watanihi al-nara wa-iam yuhajir,"ed. Usayn munis,revista del instituto egipcio de estudios istamicos en madriad 5 (1957):129-191.

20- On the capitulation of 1491, see harvey, islamic spain, pp.314-321.

21- Mersedes garcia arenal, los mqrircos (madrir, 1957), pp.251-255; antoniodominguez ortiz and bernard vincent,historia de los morircos; vida y tragedia de una minorfa(madrid,1978);andrew C.hess,"the moricos:an ottoman fifth column in sixteenth century spain,"american historical review 74(1968):1-25; and EI2, s.v.on cisneros,see also harvey, islamic spain,pp.392-334.on the arrival and resettlement of spanish muslims and morircos in north africa ,see J.D.latham"towards a study of andalusian immigration and its place in tunsian history,"ccahiers de tunisie 5(1957):203-252; and latham "the andalus in north america," EI2, vol.1pp,. 496-497.

22- Sicroff,les cantrovmes des statuts de"purete de sang"en espagne;see also S.W.baron, A social and religious history of the jews .2nd ed.(new york,1969), vol.13,pp.84-91.for a brief account,see barnard lewis,semites and antisemites(new york,1986), pp.82-84.



23- M. benady ,"the settlement of jews in gibraltar ,1704-1983,"transactiona of the jewish historical society of england 26(1979):87-110;banady,"the jewish community of gibraltar, "in sephardi heritage, vol.2:western sephardin, ed.barnett and schwab, pp.144-179; sir joshua hassan, the treaty of utrecht and the jews of gibraltar rule(gibraltar,1933) I.lopez de ayala denounces britain for these breaches of the treaty ,in historia de gibraltar(madrid,1792), p.322.

٢٤- لەبارەی توانەوەی جوولەکەکانی نیمچە دوورگەی ئیبریا لە ئەفریقیای باکوور:

H.Z.(j.w.)hirschberg,a history of the jews in north africa (leiden,1974),vol.1,pp.362-446;

لە ڕۆژهەڵات:

Minna rozen,in the mediterranean routes:the jewish-spanish diaspora from the sixteenth to eighteenth centuries(in hebrew)(telaviv,1993), esp. chap.1; mark alan epstein, the ottoman jewish communities and rheir role in the fifteenth and sixteenth centuries(freiburg,1980); lewis. jews of islam,char.3; and aryeh shuelevitz, the jews of the ottoman empire in the late fifteenth and the sixteenth centuries(leiden,1984).haim gerber, economic and social life of the Jews in the ottoman empire in the 16th and 17th centuries (in hebrew)(jerusalem,1982), provides a valuable collection of contemporary jewish and turkish documants.

لەبارەی جوولەکە سەفەڕادییەکان لە ئیمپڕاتۆری عوسمانی لە سەردەمەکانی دواتردا:

Aron rodrigue, ed, ottoman and turkish jewry:community and leadenhip(bloomington, 1992); avigdor levy, the sephardin in the ottoman empire (princeton, 1992); stanford J.shaw,the jews of the

ottoman empire and the turkish republic(new yok,1991); walter E.weiker, ottoman, turks, and the jewish polity:a history of the jews of turkey(new york,1992);and esther benbassa and aron rodrigue. juifs des balkans:espaces judio-ibirques XIV-XX siedes(paris,1991).

له بارەی روانگەی تورکەکان لەپەیوەندی لەگەڵ رۆڵ و هەڵکەوتی جوولەکەکان و غەیرە موسڵمانەکانی تر:

Ali ihsan bagls, osmanl.ticaretinde gayri muslimler:kapitulasyonlar-beratl. tuccarlar,avrupa ve hayriye tuccarlan (1750-1839) (ankara,1983) :and gulnihal bozkurt, alman-ingiliz belgelerinin ve siyast gellismelerin isigi altajnada gayrimuslim osmanli vatandaslaeinin hukuki durumu(1839-1914) (ankara, 1989).

٢٥- بەرهەمی گرینگی ناوبراو لە بارەی مێژوو و ئەدەبیاتی موسڵمانانی ئیسپانیا بە ناوی

Nafth al-tih min ghusan al-andalus al-ratih (the perfumed fragranceform the verdant branch of andalus)

کە لە ساڵی ١٦٢٩ لە قاهیرە نووسراوە و هەتا ساڵی ١٨٤٠ بە نەناسراوی ماوەتەوە. لەم کاتەدالێکۆڵەرێکی ئیسپانی بە ناوی "دن پاسکاڵ دگایانگوس" کتێبێکی هاوشێوەی ئەوەی بە زمانی ئینگلیزی نووسی، بەڵام تەنیا لەبارەی مێژووی موسڵمانانی ئیسپانیاوە بووە. وەرگێڕانی عەرەبی ئەم کتێبە بۆ یەکەمین جار لە ساڵەکانی ١٨٥٥ هەتا ١٨٦١ دا لە شاری لایدن و بە دەستی گرووپێ لە زانایانی هۆڵەندی، فەرەنسی، ئەڵمانی و ئینگلیزی چاپکرا. نوسخەی تەواوی عەرەبییەکەی لە ساڵی ١٨٦٢ دا لە میسر چاپکرا.

٢٦- لە بارەی هۆگریی دووبارەی موسڵمانەکان بە ئیسلامی ئیسپانیایی:

Henri peres,lespagne vue par les voyageurs musulmans de 1610 a 1930(paris,1937); and B.lewis, ”the cult of spain 3Dd the turkish romantics,”in lewis,islam in history, pp.129-133,originally published in



french in etudes dorientalisme dediees a la memoire de levi-provencal(paris,1962),vol.2,pp.185-190.the same french volume contains an important study by aziz ahrand, ”islam despagne et inde musulmane modeme, ”in etudes, vol.2, pp.461-470. on the contribution of the spanish arabists, see manu-ela manzanares de cirre, arabistar espandolas del siglo XIX(madrid,1972); and victor morals lezanco, africanismo y orientalismo espanol en el siglo XIX(madrid,1988).

**بەشی سێهەم:**

1- Cited in david abulafia,spain and 1492(london,1992),p.69.

2- C.F.beckingham.the achievments of prester john(london,1966).

3- Otto von freising,ottonis episcopi frisingensis chronica.sive historia de duabus civitatibus, ed.adolf hofmeister (hanover-leipzig,1912).bk.7, chap.33,pp.363-367, translated in beckingham, achievmants of prester john,p.4.on the crusader bachground of columbus s voyages, see abbas hamdani,”columbus and the recovery of J erusalem,”journal of the american orietal society 99:3948.

4- Ibn hajar al-asqalani, inba al-ghumr bi-anba al-umr, ed hasan habashi (cairo,1972), vol.3,pp.426-427; ahmad ibn ali al-maqrizi, kitab al-suluk li-mmarifat duwal al-muluk, ed. said A.F. Ashour(ccairo,1972), pt.2,vol.4, pp.495-496; abul-mahasin ibn taghri-birdi, al-nujum al-zahira fi muluk misr wal-qahira XIV, ed jamal muhammad muhriz and fahim muhammad shaltut(cairo,1971), pp.324-326.





5- pliny,natural history, 3.1.2-5.

حاجی خەلیفە کە ناسراوە بە کاتبی چەلەبی، باس لە رەوایەتییەکی تر دەکا بە نەختێك جیاوازییەوە کە بە ئاشکرا لە سەرچاوە ئەوروپییەکانی وەرگرتووە: " ئەوان بە وڵاتی ئیتیۆپی و میسر کە مەدیتەرانە لە دەریای سوور جیا دەکاتە، دەڵێن ئەفریقیاو“ بە دنیای نوێ دەڵێن ئەمریکا "تحفة الكبار في اسفار البحار"

(tuhfetul-kibarfi esfaril-bihar,ed.orhan saik gokayay [istanbul,1973],p.7).

بۆ خوێندنەوەی وەرگێڕاوی ئینگلیزی ئەم کتێبە:

Haji khalifeh,the history of the maritime wan of the turks, trans. james mitchell(london ,1831), p.4.

ئەو کتێبە لە رووی نوسخەی ئەسیلی کتێبەکە کە لە ئەستانبووڵ لە ساڵی ١٧٢٩ دا چاپ بووە کە دووهەمین کتێب بووە کە لە تورکیا چاپبووە، وەرگێڕدراوە و هەڵەی ئیملایی زۆری هەیە کە ژمارەی هەڵەکانی دەگاتە ٢٠٠ هەڵە و لە کۆتایی کتێبەکەدا هاتووە.

٦- لە بارەی روانگەی موسڵمانەکانی سەدەکانی نێوەڕاست لە پەیوەندی لەگەڵ جوغرافیای جیهان:

Andre miquel,la geographic humaine du monde musulman,4 vols. (paris,1967-1988); 19natii yulyanovic krackovskii, arabskaya geograficeskaya liliteratura, vol. 4 of izbranniye socineniya (moscow,1957), arabic translation by salah al -din uthman hasim,tarikh al- adab aljughrafi al-arabi,2 vols.(cairo,1963,1965;beirut,1987).

٧- لە بارەی نەخشەی"دنیای نوێ" لە ساڵی ١٥١٣ دا:

Savat soucek,"islamic charting in the mediterranean,"in the history of cartography, pt.2, vol.I:cartografy in the traditional islamic and south asian societies, ed.I.B.harley and david woodward(chicago,1992),pp.269-272,where earlier studies e examined.



for an excellentsur-vey,see andrew c.hess,"piri reis and the ottoman response to the voyages of discovery,"terra incognitae 6(1974):19-37.

8- Thomas D.goodrish,the ottoman turks and the new world:a study of"tarih-i hind-i garbi" and sixteenth century ottoman americana(wiesbaden,1990); and tarih-ihindi-i harbi veya hadis-i nev(a history pf the discovery of amrican)(istanbul,1987).

٩- ئەم دەقە لە لایەن یەعوسییەکی لوبنانییەوە بە ناوی "ئانتۆن رباط" دۆزراوەتەوە و پێداچوونەوەی کراوە و بەم ناوە بڵاو بۆتەوە:

Antun rabbat and published as "ri1.1lat awwal sailo1 sharqi ila amerika,"al-mashrq,September-december 1905.for a bfief description,see abelardo chedic,"primer viaje de un oriental a la )america,"america espanola 25 (1940):87-98.

بالۆێزی مەڕاکیشی لە ئیسپانیا لە ساڵی ١٧٧٩ دا لە بارەی روانگەی موسڵمانەکان بەرانبەر بە شۆڕشی ئەمریکا بەم شیوەیە راپۆڕتەکەی خۆی دەنووسێ:

Muhammad ibn uthman al-mikansi,al-iksir fi fikak al-asir,ed.muhammad al-fasi(rabat,1965),p.97.on the subsequent of knowedge , see ami ayalon,"the arab discovery of america in the nineteenth century,"middle eastern studies 20 (1984):5-17.